# ئیعجازی زانستیی

هەیڤ (35)



گۆڤارێکی زانستیی وەرزییە ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا دەریدەکات





بەکتریای گۆشت خۆر و شزوزی جنسی

ئایا مەی لە جەڵتەی دڵ دەمانپارێزێت؟

## ئێستا لە مەریخ خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت و لە خۆرهەڵاتەوە ئاوا دەبێت





الألوان في القران الكريم

پێڵاوی زیرەك

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٢٦١﴾ البقرة



# مالٌ به بەخشین کەم ناکات (حدیث صحیح)

بۆ بەهێزکردنی ئیمان لە دڵی لاوان و، بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام بە شێوەیەکی زانستی و کاریگەر و، خزمەتکردنی قورئان و سوننەت، ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لە ڕێگای ئیعجازی زانستیەوە بەردەوامە لە چالاکیەکانی و، لە ئێستاشدا دەستیکردووە بە دروستکردنی بینای ناوەند، لەسەر ڕووبەری (470م) لەسەر شەقامی سەرەکی چوارچرا بەرامبەر زانکۆی تەکنیکی سلێمانی، هەر خێرخوازێک خوازیارە بەشداری لەم پرۆژە خەیریەدا بکات بەو هیوایەی ببێتە خێرێکی هەمیشەیی بۆی، با لەڕێی ئەم ژمارە تەلەفۆنانەوە پەیوەندی بکات یان سەردانی پرۆژەکە بکات:

(07701527323) – (07702265300) – (07707601225)

نرخی گۆڤار (2000) دینار

بسم الله الرحمن الرحيم


هەندێك لەو ڕەخنانەی لە قورئان دەگیرێت 2


گەورەترین حەوزی مەلەکردن لە جیهاندا 3


زانستە شاراوەکانی ئیسلام/ 1 6


ئیعجازی قورئان لە بەکارهێنانی پۆزەتیف کۆنترۆڵ و نێگەتیف کۆنترۆڵ 9


زەوی لە نێوان زانست و قورئاندا 38


ألم نجعل له عينين 48


# هەیڤ

بەشی کوردی

یەکەم ژمارەی گۆڤاری هەیڤ لە ساڵی 2002 دا بڵاوکرایەوە

ژمارە (35) پاییزی 2014ز - 1435ک

www.haiv.org

خاوەنی ئیمتیاز
نەشئەت غەفور سەعید
009647702265300

سەرنووسەر
د. دارا گوڵ حامید
009647702147004

جێگری سەرنووسەر
خالید حەسەن عەلی
009647501231123

بەڕێوەبەری نووسین
هاوژین طالب رضا
009647707601225

پارێزکاری یاسایی
موحەممەد ڕەئووف ئەحمەد
009647701527323

دەستەی نوسەران
١- فارووق ڕەسووڵ یەحیا
٢- جەمال موحەممەد ئەمین
٣ - د. دیاری ئەحمەد ئیسماعیل
٤- شەماڵ موفتی
٥- د. محمد جميل الحبال
٦- د. کاوە فەرەج سەعدون
٧- بەرزان ئەبوبکر
٨- موحەممەد ئەحمەد
٩- ئەردەڵان صاڵیح عەزیز
١٠- موحەممەد حوسەین کەریم

دیزاین
زانیار ئەنوەر ئەحمەد
Zanyarkurdish@gmail.com
009647701487413

بۆ پەیوەندی
haivkurdy@gmail.com
www.facebook.com/kurdhaiv

ناونیشان: سلێمانی- شەقامی مامۆستایان- تەلاری حاجی موحەممەد پێنجوینی- نهۆمی (٣)

مطبعة كاكون
07700248181

# موعجیزاتی قورئانی

## ڕۆشنایی دووهەم
## ئەم ڕۆشناییە سێ نووری هەیە

ن: مامۆستا سەعیدی نوورسی
و: فارووق ڕەسووڵ یەحیا   Faruq_r@hotmail.com



### نووری یەکەم:

قورئانی پیرۆز: ڕەوانیی بە خوڕ و.. ساغیی ناوازە و.. پشتگیریی مەحکەم و.. پەیوەندیی توندوتۆڵ و.. هاوکاریی بەهێزی چ لە نێوان ڕستەکانی و چ لە نێوان سیما و ڕوخسارە پێکهێنەرەکانی ئەو ڕستانەدا کۆ کردووەتەوە. هەروەک هاوئاهەنگی‌یەکی بەرزی لە نێوان ئایەت و ئامانجەکانی‌دا ساز داوە. ئەمەش بە شایەتیی زانستی: «ڕەوانکاری» و «گوزارەکاری» و بە شایەتیدانی هەزاران پێشەوای ئەم زانستانە، وەک: زەمەخشەری و سەککاکی و عەبدولقاهیری جورجانی. خۆ هەرچەندەش نزیکەی هەشت نۆ هۆکاری گرنگ هەن کە ئەو هاوئاهەنگی و هاوکاری و پشتگیری و ساغی و ڕەوانی‌یە دەشێوێنن، کەچی ئەو هۆکارانە هیچ کاریگەری‌یەکیان لە شێواندنی ئەو سیفەتە ناوبراوانەی قورئاندا نەبووە، تەنانەت پتر پشتی ڕەوانی و ساغی و پشتگیریی ڕستە و ئایەت و ئامانجەکانی قورئانیان گرتووە! هێندە نەبێت کە حوکمی خۆیان ڕایی کردووە و لە پشت پەردەی ڕێسا و ڕەوانی‌یەوە سەریان دەرهێناوە، تاکو ڕەوانیی هۆنینی قورئان گەلێ واتای گەورە و بەنرخ بەدەستەوە بدات، بە وێنەی «چرۆ»ی درەخت کە لە قەدی خشت و ڕێکی درەختەکاندا دەردێن و هەندێ گۆپکە و چوکڵەی بەرز و نزمی تێدا پێکدەهێنن، کەچی ئەم وردە چوکڵانە ڕێکیی لەشولاری درەختەکان نائاڵۆزێنن، بەڵکو لە ڕێیانەوە ئەو بەروبوومانە بە درەختەکان دەدرێن کە پتر جوانی و کەماڵی ئارایشتی درەختەکەیان پێ تەواو دەبێت.

چونکە: قورئانی پیرۆز بەش بەش و پچڕپچڕ لە ماوەی بیست و سێ ساڵ و لە کاتی پێویستدا نازڵ بووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێندە پێکەوەگونجانی تەواوی دەرخستووە کە دەڵێی سەرانسەری قورئان بە یەک جار نازڵ بووە.. هەروەها ئەم قورئانە پیرۆزە لە ماوەی بیست و سێ ساڵ و لەبەر چەند هۆکارێکی جیاجیای نازڵ بوون هاتووە، کەچی ئەوەندە پشتگیریی تەواوەتیی تێدا دەردەکەوێت کە دەڵێی تەنها لەبەر یەک هۆکار نازڵ بووە.. هەروەها قورئان بۆ وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی دووپاتبووی جیاجیا هاتووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێندە تێکەڵی و یەکگرتنی تەواوی پێوە دیارە کە دەڵێی وەڵامی تەنها یەک پرسیارە.. هەروەها قورئان بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمەکانی گەلێ ڕووداوی جۆراوجۆر نازڵ بووە، کەچی هێندە ڕێکوپێکیی کامڵ و تەواو پێشچاو دەخات کە دەڵێی ڕوونکردنەوەی حوکمی تەنها یەک ڕووداوە.. هەروەها ئەم قورئانە پیرۆزە بە چەشنێک نازڵ بووە کە گوفتارە بەرزە خواییەکانی هێناوەتە ئاستی چەند شێوازێک کە لەگەڵ ڕادەی تێگەیشتنی چەندەها قسە بۆکراوی لەژمارەبەدەر و گەلێ حاڵەتی وەرگرتن و تێگەیشتنی جۆراوجۆردا بگونجێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێندە ڕەوانیی ناسک و لەیەکچوونی جوانی لە خۆدا دەرخستووە کە دەڵێی تەنها بۆ یەک حاڵەت و یەک ئاستی تێگەیشتن نازڵ بووە! تەنانەت سیفەتی: «ڕەوانی»، بە وێنەی ئاوی سەلسەبیل، بەناو هەموو قورئاندا گوزەر دەکات.. هەروەها ئەو قورئانە پیرۆزە ڕووی گوفتاری ئاراستەی گەلێ جۆر و چینی لە یەک دووری خەڵکی کردووە، کەچی هێندە ئاسانیی «بەیان» و، پاراویی ڕێسا و ڕوونیی تێگەیاندنی تێدا دیارە کە دەڵێی گشت ئەوانەی لەگەڵیان دەدوێت تەنها یەک چین و توێژن، بە ڕادەیەک کە هەموو کۆمەڵ و توێژێک پێی وایە ڕووی گوفتاری قورئان ڕاستەوخۆ ئاراستەی ئەو کراوە.. هەروەها قورئان بۆ ئەوە نازڵ بووە کە خەڵکی بەرەو چەند ئامانجێکی ئیرشادیی پلەپلە و جیاجیا ڕێنمایی بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێندە ئیستیقامەتی تەواوەتی و.. هاوسەنگیی ورد و.. ڕێکوپێکیی جوان و ڕەنگینی پێوە دیارە کە دەڵێی تەنها بۆ یەک ئامانج نازڵ بووە.

جا هەرچەند ئەم هۆکارانە مایەی هەڵبزرکان و شێواندنی واتا و ڕوخسارن، کەچی هەموویان لە دەرخستن و پیشاندانی ئیعجازی بەیان و، ڕەوانی و، لەگەڵ یەک گونجانی قورئاندا، بەکار هێنراون!

بەڵێ، هەرکەسێک خاوەنی دڵێکی ساغ و عەقڵێکی کامڵ و ویژدانێکی هەستیار و چێژێکی تەواو بێت، هەر بۆ خۆی: ڕەوانی‌یەکی جوان و.. ڕێکوپێکی‌یەکی ناسک و.. ئاوازێکی بەتام و.. زمانپاراوی‌یەکی بێوێنە، لە ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆزدا دەبینێت!

خۆ هەرکەسێکیش بینایی دڵی کوێرنەبووبێت، بێ هیچ گومانێک «چاو»ێک لە قورئاندا دەبینێت کە قورئانی پیرۆز بەهۆی ئەو چاوە و بەوپەڕی ڕوونی: سەرجەمی بوونەوەرانی ڕواڵەتی و نادیار دەبینێت و بە وێنەی لاپەڕەی کتێبێک دەبن لە بەردەستی‌دا کە بە ویستی خۆی هەڵیاندەگێڕێتەوە و، بە هەر شێوازێک بیەوێت واتاکانی لێک دەداتەوە و بە خەڵکیان دەناسێنێت!

گەر بمانەوێت ڕاستیی ئەم «نووری یەکەم»ە بە نموونەکانیەوە ڕوون بکەینەوە، ئەوا پێویستمان بە نووسینی چەند بەرگێک دەبێت! بۆیە بەو ڕوونکردنەوانە واز دەهێنین کە تایبەتن بەم ڕاستییە و لە گشت «پەیامە عەرەبی‌یەکان»[1] و «ئامارەکانی ئیعجاز» و بیست و پێنج وتەکانی پێشوودا باس کراون. بگرە هەر قورئان بۆ خۆی سەرتاپا نموونەی ئەم حەقیقەتەیە، بۆیە وا بە یەک جار هەموو قورئان پێش چاو دەخەم و بە نموونە دەیهێنمەوە!

(١)سیازدە پەیامن لە ناوەندی کتێبی (مەسنەویی نووری)دا، کە بەرگێکی سەربەخۆی سەرجەمی پەیامەکانی نوورە و، بە پشتیوانیی خوای گەورە بە کوردی بڵاوی دەکەینەوە. (وەرگێڕ)



# هەندێك لەو ڕەخنانەی لە قورئان دەگیرێت

ن: د. کەریم ئەحمەد
Karimdawody@yahoo.com

## دەروازە: کاریگەری نەرێی ریوایەتەکان لەسەر قورئان:

ئەوانەی ڕەخنەیان لە قورئان گرتووە لەم سەردەمەدا پشتیان بە هەندێک شت بەستووە کە یارمەتی داون، لەوانە:

1. ئەو هەموو ریوایەتە لاواز و هەڵبەستراوانەی دەربارەی نووسین و کۆکردنەوەی قورئان ریوایەت کراون.
2. ئەو هەموو ریوایەتە لاواز و هەڵبەستراوانەی دەربارەی ناسخ و مەنسوخ هاتوون.

ڕاستە ئەمانە تارادەیەک بەڵگەی ئەمانەتی زانستین، بەڵام لەولاشەوە بەڵگەن لەسەر دوو شت:

یەکەم : هەست نەکردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر نەوەکانی داهاتوو.

دووەم: هەست نەکردن بە گەورەیی ئەو ئیشەی کە دەیکەن، ئەویش قسەکردنە لە کتێبی خوادا، ئەو کتێبەی کە خوا دەربارەی فەرموویەتی « احکمت اياته» و پەیمانی کۆکردنەوە و پاراستنی داوە .

3. ئەو ئیسرائیلییات و ریوایەتە هەڵبەستراو و لاوازانەی زانایانی تەفسیر ریوایەتیان کردووە لە تەفسیرەکانیاندا دەربارەی واتا و مەبەستی ئایەتەکان.
4. ئەو هەموو ریوایەتانەی زانایانی شیعە داویانەتە پاڵ ئیمامەکانیان دەربارەی ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئاندا و دەسکاریکردنی قورئان لەلایەن هاوەڵانەوە و بوونی موسحەفی فاتیمە و جەفر و جامیعە و سورەتی ویلایەت و... هتد.

بەکورتی، زۆرێک لەو ریوایەتانەی دەربارەی قورئان ریوایەت کراون لە هەندێک بوارەکانی زانستەکانی قورئان کاریگەری نەخوازراویان هەبووە لەسەر ئیسلام بە گشتی و قورئان بە تایبەتی، وە دەتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم ئەو کاریگەرییە نەخوازراوانەی ریوایەتە هەڵبەستراو و لاوازەکان، لەسەر ئیسلام هەیانبووە هیچ شتێکی تر نەیبووە، وە ئەو زیانەی ئەو ریوایەتانە لە ئیسلامیان داوە هیچ دوژمنێک لێی نەداوە، هەر لە قورئانەوە بیگرە تا مێژووی ئیسلام، هەر بۆیەشە دوژمنانی ئیسلام زۆر جەخت دەکەنەوە لەسەر باسکردنی ئەو جۆرە ریوایەتانە! ئەگەر ئەوانەی هەڵیانبەستووە لە دوژمنکاری ئیسلامەوە، وە یا لە نەزانی وە لەبەر بەرژەوەندییەکی تەسک هەڵیان بەستووە، بەڵام ئەو زانایانەی بە زیندوێتی هێشتوویاننەتەوە یا لەبەر ئاسۆ تەسکی، وەیا لە هەستنەکردن بە بەرپرسیارێتی بووە، ئەگینا ئەگەر کەمێک ژیری و لۆژیکیان بخستایەتە کار نەدەبوایە ئەو کارە بکەن. ڕەنگە بوترێت ئەو شتانە لە ڕووی ئەمانەتی زانستییەوە کراوە، بەڵام ئەمانەتی زانستی ئەوە ناگەیەنێت هەر نەزانێک یا ناحەزێک لە جێی خۆیەوە ناماقوڵییەکی کردبێت تۆ بێی بیگێڕیتەوە با هەڵە و بێ بنەماییەکەشی وەکو ڕۆژی نیوەڕۆ دیاربێت، بە بیانووی ئەوەی کە مادەم من بەسەنەدەوە ریوایەتم کردووە ئیتر گەردنی خۆمم ئازادکردووە و بەرپرسیارێتییەکەم خستۆتە ئەستۆی خوێنەر، بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت چ بیانوویەکی داوەتە دەستی دوژمنانی ئیسلامەوە بۆ ئەوەی تانەی لێدەن و ڕەخنەی لێبگرن.

ئەم قورئانە وەکو بینایەکی زۆر گەورەو جوان و تۆکمە وایە کە هەموو خشتەکانی جوان و تۆکمە بن و لەجێی خۆیاندا دانرابن و بە تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەریدا (زیاد لە هەزار و چوارسەد ساڵ) نە درزێکی تێکەوتبێت وە نە خشتێکی تێکچووبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە گەڵ تێپەڕبوونی کاتدا جوانتر و تۆکمەتر بووە، بەڵام لەولاوە کەسانێک بێن باسی کات و چۆنێتی دروستبوونەکەی بەجۆرێک بکەن کە پێچەوانەی ئەم تۆکمەیی و جوانی و ڕێکییەی بێت و وای باسبکەن کە لەسەر بناغەیەکی ناپتەو دامەزرابێت و خشتەکانی بێ ڕەچاوکردنی هیچ بنەمایەکی ئەندازیاری خرابنە سەر یەک! ئایا باوەڕ بەو ڕاستییانە دەکەیت کە بەچاوی خۆت دەیانبینی یا ئەو قسانەی ئەو کەسانە دەیگێڕنەوە؟ قورئانیش بەهەمان شێوە، کاتێک تەماشای دەکەیت و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەیت دەبینی سەرتاپا ڕێکوپێکی و تۆکمەیی و جوانییە، نەک هەموو وشەیەکی بەڵکو هەموو پیتێکی لە جێی خۆیدایە و هەزار و چوارسەدساڵ لەمەوبەر چۆن نوسراوەتەوە ئاوها بێ زیاد وکەم ماوەتەوە و کەس نەیتوانیوە پیتێکی لێ بگۆڕێت و سەرەڕای نەبوونی چاپخانە و نووسینەوەی بە جیا جیا لەم وڵات و لەو وڵات بە دەسخەت لەگەڵ ئەوەشدا کەمترین جیاوازی لە نێوان

دوو نوسخەیدا نییە[1]. نەک هەر ئەوەندە بەڵکو زانستی نوێش بێت و دەیان بەڵگەی بەرجەستە بداتە دەستەوە لەسەر ڕاستێتی زانیارییەکانی ناوی و ڕۆژگاریش بە بەردەوامی ڕاستی زانیارییە ڕابردوویی و بەڵێن و هەواڵە داهاتووییەکانی دەربخەن، بەڵام لەولاوە هەندێک ریوایەت بخوێنیتەوە کە ئەگەر باوەڕیان پێبکەیت پێچەوانەی ئەو ڕاستییانەت بەدەستەوە دەدەن و ئەو متمانەیەی قورئان خۆی لە دڵ و مێشکتدا دروستی دەکات ئەوان لەقی دەکەن!.

با بە نموونەیەک ئەم ڕاستییە ڕوون بکەینەوە: ئەو ریوایەتەی کە دەڵێت سورەتی ئەحزاب ئەوەندەی سورەتی بەقەرە بووە بەڵام نەسخ کراوە[2]! ئەوەی ئەمەی ریوایەت کرد ئەگەر کەمێک ژیری و لۆژیکی بخستایەتە کار ئاوها شتێکی ریوایەت نەدەکرد کە پێچەوانەی سادەترین بنەماکانی لۆژیکە، سورەتێک کە ئێستا 73 ئایەتە بەگوێرەی ئەو ریوایەتە ئەوەندەی سورەی بەقەرە بووە کە 286 ئایەتە و ئایەتەکانیشی لەمانەی ئەحزاب درێژترن و سورەی ئەحزاب 10 لاپەڕەیە و بەقەرە 48 لاپەڕەیە، واتە بە پێی ئەو ریوایەتە نزیکەی 38 لاپەڕەی کە دەکاتە چوار لە سەر پێنجی لابراوە و نەسخ کراوە، بێ ئەوەی هیچ کەسێک لەوانەی ریوایەتیان کردووە تەنها یەک ئایەتیش لەو ئایەتە نەسخکراوانە بێنێتەوە، یا هیچ نەبێت ئەو زانایانە داوا لەو ڕاوییە درۆزن و لە خوا نەترسانە بکەن بۆ سەلماندنی ڕاستی قسەکەیان ئایەتێک لەو ئایەتانە باس بکەن یا بپرسن ئایا ئەو ئایەتە نەسخکراوانە باسی چییان دەکرد و لە کوێی سورەتەکەدا بوون و بۆچی نەسخکراون؟! چونکە کاتێک ئەو سورەتە دەخوێنیتەوە هەست بە هیچ ناهارمۆنییەک ناکەیت و هەست ناکەیت شتێکی لێ قرتابێت! هەمان شت بە نیسبەت ئەو ریوایەتەی دەڵێت سورەتی (التوبة) ئەوەندەی سورەتی (البقرة ) بووە و بەڵام نەسخ کراوە [3]

ئەمە دەربارەی ئەو ریوایەتانەی لە لایەن زانایانی ئەهلی سوننەوە ریوایەتکراون، ئەمما ئەوانەی کە زانایانی شیعە ریوایەتیان کردووە ئەوە هەر باس ناکرێن لە گەورەیی ئەو زیانەی بە قورئان وئیسلامیان گەیاندووە، ئەمان نەک ریوایەت گەلێکیان لە ژێر ناونیشانی نووسینەوەی قورئان و کۆکردنەوەیدا ریوایەتکردووە کە نالۆژیکین و پێچەوانەی ڕاستییەکانی قورئان و واقیعی قورئانن، بەڵکو بە ڕاشکاوی و لە ژێر کاریگەری دەمارگیری مەزهەبیدا و لەبەر خاڵیی بوونی قورئان لە بنەماکانی عەقیدەی ئیمامەتی شیعەییانە و نەهاتنی ناوی ئیمامەکانیان و پیاهەڵدانی قورئان بە هاوەڵانی پێغەمبەردا، قورئان تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە دەسکاری کراوە و گۆڕانکاری تێدا کراوە و لێی قرتێنراوە! ئەم عەقیدەیەی کە بووەتە سەرچاوەیەکی سەرەکی ناحەزانی ئیسلام بۆ تانەدان لە قورئان[4].

---

(١) بە پێچەوانەی تەورات و ئینجیلەوە کە دوو چاپیان نییە لەیەك بچن و ڕۆژانە و بەردەوام گۆڕانکارییان تێدا دەکرێت!

(٢) علوم القرآن عند ابن عبد البر/ رسالة ماجستير للباحث محمد بن عبد الله بن جابر القحطاني ص٢٦٤.

(٣) الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٩/ تأليف أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الظاهري / الناشر : دار الكتب العلمية – بيروت الطبعة الأولى ، ١٤٠٦تحقيق : د. عبد الغفار سليمان البنداري

(٤) بڕوانە کتێبی( فصل الخطاب في تحريف كتاب رب الارباب ) نووسینی زانای بەناوبانگی شیعە محمد تقي النوري الطبرسي خاوەنی کتێبی مستدرك الوسائل کە یەکێکە لە هەشت کتێبە سەرچاوەکان بەلای شیعەوە و لەبەر پلە و پایەی لە نزیك قەبری ئیمامی عەلییە وە نێژراوە ئەم کتێبە زکریا بوترس لە کەناڵی (الحياة)ی مەسیحی بە بەردەوامی ئاماژەی پێدەدات و بەڵگەی لێدەهێنێتەوە لە سەر ئەوەی کە ئەوەتا موسڵمانەکان خۆیان دەڵێن قورئان دەسکاریکراوە!.

# گەورەترین حەوزی مەلەکردن لە جیهاندا

**و: سازگار عوسمان**



ئەمە گەورەترین حەوزی مەلەکردنە لە جیهاندا،کە وەکالەتی ئاسمانی ئەمریکی (ناسا) دروستیکردوە، کەپڕکراوەتەوە بە زیاتر لە (23000) م² لە ئاو. سەیر لەوەدایە ئەم حەوزە تایبەتکراوە بە ڕاهێنانی کەشتیوانانی ئاسمانی لەسەر چاکردنی ئەو لە کارکەوتن و پەککەوتنانەی کە توشی گالیسکە ئاسمانیەکان دەبێت.. بێگومان ئەمە باشترین ژینگەیە بۆ ڕاهینان،چونکە زانایان ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە مەلەکردن لە ئاسماندا و مەلەکردن لە ئاودا تا ڕادەیەکی زۆر لە یەك دەچن و وەك یەك وان.

پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ڕاستی هاتوچۆ و مەلەکردنی گالیسکەکانی لە ئاسماندا بۆ وەسف کردوین...هەر وەك چۆن دەفەرموێت: ﴿ لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ (یس)

هەر بۆیە قورئان وشەی مەلەکردن(یسبحون)ی بەکارهێناوە تاوەکو دەربڕینێك بێت بۆ هاتوچۆکردنی گالیسکەکان لە ئاسماندا، هەر ئەمەشە کە زانایان جەختی لەسەر دەکەنەوە لە ئێستادا.

پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە کە: ئایا ئەم وشەیە (یسبحون) بەڵگە نیە لەسەر وردی و دروستی قورئانی پیرۆز؟

سەرچاوە: www.dailymail.co.uk



# سەبارەت بە قورئان وتوویانە

(ئەڵقەی دووەم)

نووسین و ئامادەکردنی: دکتۆر عیمادەدین خەلیل
و:م. فارووق ڕەسووڵ یەحیا Faruq_r@hotmail.com

ڕێژی بلاشێر

(ڕێژی بلاشێر)-Régis Blachère- لە نزیکی پاریس لەدایک بووە. قۆناغی دواناوەندیی لە «دارولبەیزا»ی مەغریب خوێندووە. ساڵی 1922ز بە زمانی عەرەبی کۆلێژی ئادابی لە «جەزائیر» تەواو کردووە. کراوە بە مامۆستا لە پەیمانگای «مەولای یووسف» لە شاری «ڕیبات». پاشان دەست نیشان کراوە بە بەڕێوەبەری پەیمانگای لێکۆڵینەوە باڵاکانی مەغریب لە شاری «ڕیبات» 1935-1924ز. خوێندنگەی زمانەکانی خۆرهەڵات لە پاریس بانگهێشتی کردووە بۆ مامۆستای کورسیی ئەدەبی عەرەبی1935-1951ز. ساڵی 1936ز. بڕوانامەی دکتۆرای هێناوە. بووە بە مامۆستای وانەبێژ لە «سۆربۆن» 1938ز و، سەرپەرشتیاری گۆڤاری (المعرفة) بووە کە بە هەردوو زمانی (عەرەبی و فەرەنسی) لە پاریس بڵاوبووەتەوە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: «مێژووی ئەدەبی عەرەبی» پاریس 1952ز، وەرگێڕانێکی نوێ بۆ قورئانی پیرۆز لە سێ بەرگدا پاریس 1947-1952ز.

هەندێ لە وتەکانی ڕێژی بلاشێر:

1-«بێ گومان ئەگەر شتێک هەبێت «وەرگێڕان» دەستەوسان بێت لە دەربڕینیدا بریتییە لە: ئیعجازی ڕەوانکاری و، وشەیی و، زایەڵەی ڕەزمی ئەو ئایەتانەی کە لەو کاتەدا نازڵ بوون. بێ گومان دوژمنانی محەمەد ﷺ هەڵەیان کرد لەوەدا کە نەیانویست جگە لە چەند گۆرانییەکی سیحراوی و، نوشتە و جادوو، شتێکی دیکە لەمەدا ببینن. خۆ هەرچەندە ئێمە لە ڕێی لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕاندا زانیاریمان لە بارەی هەواڵدانی کاهینەکانەوە هەیە، ئەوا دەتوانین لەگەڵ ئەوەدا لەو بڕوایەدا بین کە ئەوە ڕایەکی بێ سەرە و بەرە و پڕوپووچە، چونکە ئەو ئایەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای ئەم سوورەتانەدا دووپاتی دەکردنەوە، هەڵمەت و، درەخشانی و، شکۆمەندییەکی ئەوتۆیان تێدایە کە قسەی زمانپاراوەکانی مرۆڤ زۆر لە دوای خۆیان بەجێ دەهێڵن کە دەتوانین لە ڕێی ئەو دەقانەوە گەیشتوونەتە دەستمان بیانهێنین و (بەراوردیان بکەین)[1]».

2-«قورئان نەک هەر تەنها بە ناوەڕۆک و ڕێنماییەکانی موعجیزەیە، بەڵکو بە هەمان جۆر، دەکرێ بوترێ پێش هەموو شتێک شاکارێکی ئەدەبیی ڕەنگینە و، لە سەرووی هەموو ئەو شاکارانەوەیە کە مرۆڤایەتی دانی پێدا ناوە و ڕێزی بۆ داناوە.. خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب — خوای لێ ڕازی بێت — لە سەرەتاوە نەیارێکی سەرسەختی ئایینە نوێکە بوو. بەڵام دوای بیستنی بڕگەیەکی قورئان بوو بە توندوتۆڵترینی یارمەتیدەرانی ئایینەکە. دواتر قسە دەکەین لەسەر ڕادەی شەیدابوونی بە دەقی قورئان دوای خوێندنەوەی لە لایەن ئیماندارانەوە"[2].»

3-«ئیعجاز، ئەو موعجیزە پشت ڕاستکەرەوەیەی بانگەوازی محەمەدە ﷺ کە لە قسە دنیاییەکانیدا بەرەو ئاستی شکۆی قورئان بەرز نەبووەتەوە"[3].»

4-«لە هەموو ئەو بوارانەوە کە لێیانەوە ڕوانیومانە، لە زانستەکانی زمان و فەرهەنگ و ڕەوانکاری، قورئان ورووژاندنێکی هێنایە کایەوە و چەندین چالاکیی ئەوتۆی ژیاندەوە کە پتر لە بارودۆخی شارستانی دەچێت هەتا ئەوەی داخوازییەکانی هێنانەکایەی شەریعەتی ئیسلام بێت. گەلێ بواری تر هەن کە قورئان وەک هۆکارێکی بنەڕەتی تیایاندا ئامادەیە. کاریگەریی قورئانیش لەمانەدا تەنها کاریگەریی توخمێکی بێدارکەرەوە نییە، بەڵکو کاریگەریی توخمێکی داهێنەرە کە بە چۆنێتییە خۆییەکەی پتر هێزەکەی تۆکمە و دامەزراو دەبێت"[4].»

بوازار

(مارسیل بوازار) Marcel Boisard بیریار و مافناسێکی فەرەنسیی هاوچەرخە. بایەخێکی گەورەی بە مەسەلەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و مافی مرۆڤ داوە. گەلێ توێژینەوەی نووسیوە بۆ ئەو کۆنگرە و گۆڤارە دەورییانەی کە بایەخ بەم دوو مەسەلەیە دەدەن. کتێبەکەی بە ناوی "مرۆڤایەتی لە ئیسلامدا" کە لە هەمان بایەخدانەوە سەری هەڵداوە، نیشانەیەکی ڕووناکی بەخشە لە بواری لێکۆڵینەوەکانی خۆرئاوادا بۆ ئیسلام، ئەوەش لەبەر تایبەتمەندییەکانی کە بریتین لە: بابەتی بوون و، قووڵی و پشت بەستنی توندوتۆڵی بەو سەرچاوانەی کە لایەنگیری و هەوا و ئارەزوو دیلیان ناکەن. جگە لە نووسینەکانی تری لە بارەی ئیسلامەوە.

هەندێ لە وتەکانی:

1- «"لە دەمی پێناسەی دەقی پیرۆز لە ئیسلامدا، پێویستە باسی دوو توخم بکرێت. یەکەمیان ئەوەیە کە کتێبێکی نازڵکراوی ئەزەلییە و نامەخلووقە. دووهەم کە "قورئان"ە، واتە گوفتارێکی زیندووە لە دڵی کۆمەڵدا! هەروەها ئەو ناوەندەی نێوان خوا و مرۆڤە کە هەموو کارێکی "ڕێکخستنی قەشەیی" بێ بایەخ دەکات! چونکە وەک مەرجەعێکی بنەڕەتی جێی ڕازی بوونە و، سەرچاوەیەکی بنەڕەتیی ئیلهام بەخشینە. هەتا ئەم ڕۆژگارانەی خۆیشمان نموونەیەکی بەرزی ئەدەبی عەرەبییە کە مەحاڵە لاسایی بکرێتەوە. نەک هەر تەنها ئەوەی کە نموونەیەکی پێشەنگی کاری ئەدەبییە بۆ ئەوەی چاوی لێ بکرێت، بەڵکو سەرچاوەی ئەو ئەدەبی عەرەبی و ئەدەبی ئیسلامییەشە کە قورئان دایهێنا، چونکە ئەو ئایینەی کە ئەم قورئانەی بە "وەحی" نارد، بناغەی گەلێ ڕێبازی فیکرییە کە دواتر ئەم کتێبە ناوبانگی پێ دەرکرد"[5].»

2-"قورئان بە ڕەتکردنەوەی جیاکاری لە نێوان شتی ڕۆحی و

(1) مێژووی ئەدەبی عەرەبی، 2/31.

(2) قورئانی پیرۆز لاپەڕەی 102 - 103.
(3) هەمان سەرچاوە، 104
(4) هەمان سەرچاوە، 105-104.
(5) مرۆڤایەتیی لە ئیسلامدا: لاپەڕەی: 53-52.

شتی زەمەنیدا، سەلماندی کە لە هەمان کاتدا ئایینە و سیستەمی کۆمەڵایەتیشە. بەڵگەنەویستە کە قورئان و ئەو ڕێگایەش کە پێی وابوو دەتوانرێت تیایدا بەکار بهێنرێت، بە قووڵی مۆرکی خۆیان لەسەر کۆمەڵگا بەجێ هێشت"(6).

3- «"قورئان تەنها چاکسازیی ڕەوشتەکانی عەرەبی جاهیلییەتی تێدا حساب نەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو شەریعەتە نەمر و کامڵەی لە خۆدا هەڵگرتووە کە پڕاوپڕی ڕاستییە مرۆییەکان و پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی هەموو کات و سەردەمێکن"(7)!»

4- «"قورئان کەش و هەوای ژیانێک دروست دەکات کە لە ئەنجامدا هاو ئاوازییەک لە نێوان گوزارشتە زیهنییەکاندا و، یەکسانییەک لە نێوان شتە ماقووڵەکان و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکاندا پێکدەهێنێت، زۆر زیاتر لەوەی کە لە کارە سیاسییەکان و نیشانە ئایدۆلۆجییەکان چاوەڕوان دەکرێت کە دەدرێنە پاڵ دەوڵەتەکان. سەبارەت بە پلەی کاریگەریی هەرە گەورەی قورئان هەر ئەوە بەس نییە کە لەبارەی کاریگەریی لەسەر زەینی ئیسلامیی هاوچەرخ باس دەکرێت، چونکە قورئان هێشتا هەر سەرچاوەی سەرەکیی ئیلهامی تاک و کۆمەڵە، هەروەها دوا پەنا و دالدەی موسڵمانانە"(8).»

5- «"بێ گومان ئەو ئامرازانەی کە قورئان دابینیان دەکات، دەتوانن کۆمەڵگایەکی نوێ بنیات بنێن"(9).»

### پۆتەر

"دێبرا پۆتەر" Deborah Potter ساڵی1954ز لە شاری ترافێرزی ویلایەتی میشیگنی ئەمریکا لە دایک بووە. لە بەشی ڕۆژنامەوانیی زانکۆی میشیگن دەرچووە. ساڵی 1980ز و دوای هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێک لە بانگخوازانی ئیسلام لە ئەمریکا و لە ئەنجامی قەناعەتێکی قووڵ بەوەی کە جگە لە ئیسلام هیچ ئایینێک ناتوانێت خواستەکانی مرۆڤ (نێرینە بێت یان مێینە) بهێنێتەدی، موسڵمان بووە.

هەندێ لە وتەکانی:

1- «"کاتێ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزم تەواو کرد، نوقمی هەستێک بووم بەوەی کە تەنها قورئان ئەو "حەق"یە وەڵامە شیفابەخشەکانی لە خۆ گرتووە لەبارەی باسەکانی "بەدیهاتن" و جگە لەوانەش. هەروەها بە ڕێگایەکی مەنتیقی ڕووداوەکانمان پێشکەش دەکات کە دەبینین پێچەوانەی هەندێکە لەوانەی کە لە کتێبە ئایینییەکانی تردا هاتووە! بەڵام قورئان لەسەر ڕەوتێکی ڕەنگین و شێوازێکی گومان بڕدا لێیان دەدوێت کە هیچ گومانێک لەوەدا ناهێڵێتەوە کە بە دڵنیاییەوە ئەم گوفتارە لە لایەن خوای گەورەوەیە"(10).»

2- «"هەر تەنها ناوەڕۆکە ئیلاهییەکەی قورئانی پیرۆز بەرپرسە لە ڕاپەڕاندنی مرۆڤ و، ڕێنمایی کردنی بۆ زانین و ناسینی "بەدیهاتن" کە زانینێکە هەموو سەردەمێک داخوازیەتی"(11).»

3- «"محەممەد ﷺ ئەو پیاوە نەخوێندەوارەی کە لە ژینگەیەکی جاهیلیدا پێگەیشتووە، چۆن توانیی ئەو موعجیزاتانەی گەردوون بزانێت کە قورئان وەسفی کردوون و، زانستی نوێ هەتا ئەمڕۆش هەوڵی ئەوە دەدات کە پەردەیان لەسەر لابدات؟ کەواتە دەبێ ئەم گوفتارە گوفتاری خوای گەورە بێت"(12)!»

(6) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە: 206-207.
(7) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە: 109.
(8) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە: 343.
(9) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە: 345.
(10) رجال ونساء اسلموا، 100/8.
(11) هەمان سەرچاوە: 113/8.
(12) هەمان سەرچاوە: 109/8.

### بۆکای

"د. مۆریس بۆکای" Maurice Bucaille پزیشک و زانا ناسراوەکەی فەرەنسایە. کتێبەکەی بە ناوی "قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زانست" لە هەموو ئەو دانراوانەی لەم چەشنە بابەتە دواون، ڕەسەنتر و گشتی تر و قووڵترە. دیارە کاری بۆکای لەم کتێبەدا چەندین قەناعەتی ڕەهای بە ڕاستیی کتێبەکەی خوا پێ بەخشیوە و، ئنجا بە ڕاستیی ئەو ئایینەش کە ئەو کتێبە هێناویەتی. چەند جارێک بانگهێشت کراوە بۆ دیداری هزری ئیسلامی کە هاوینی هەموو ساڵێک لە جەزائیر ساز دەکرێت. لەوێ پتر بۆی ڕەخسا کە لە ئایینی ئیسلام وەک فیکر و ژیان شارەزا ببێت.

هەندێ لە وتەکانی:

1- «"یەکەم شت لێکۆڵینەوەم لە قورئانی پیرۆزدا کرد، بێ ئەوەی فکرێکی پێشینەم لە بارەیەوە هەبێت و، بە ڕێگایەکی بابەتییانەی تەواو لە دووی ئەوە دەگەڕام کە بزانم دەقی قورئان هەتا چەندە لەگەڵ دەرهاویشتەکانی زانستی نوێدا یەک دەگرنەوە. من پێش ئەم لێکۆڵینەوەیە و لە ڕێی وەرگێڕانەکانەوە دەمزانی کە قورئان چەند جۆرێکی زۆری دیاردە سروشتییەکان باس دەکات. بەڵام زانیارییەکانم لەم ڕووەوە کەم و کورت بوون. بەڵام بە فەزڵی لێکۆڵینەوەیەکی وریایانە بۆ دەقە عەرەبییەکە، توانیم لیستێک لەم ڕووەوە دەربهێنم و، دوای لێبوونەوەم لەو کارەم، تێگەیشتم کە قورئان هیچ قسەیەکی تێدا نییە کە لە ڕووی زانستی نوێوە ڕەخنە هەڵبگرێت!

هەر بە هەمان لێکۆڵینەوەی بابەتییانە، هەمان پشکنینم بۆ پەیمانی کۆن و ئینجیلەکان کرد. سەبارەت بە پەیمانی کۆن (تەورات) لە یەکەم کتێبی بەولاوە (سیفری تەکوین) پێویستی بە ڕۆشتنی زیاتر نەکرد، چونکە چەندین قسەی ئەوتۆم تێدا بینی کە ناتوانرێت لەگەڵ زۆربەی دەرەنجامە جێگیرەکانی زانستی سەردەمدا یەک بخرێن.

سەبارەت بە ئینجیلەکانیش، دەبینین دەقی ئینجیلی مەتتا بە ئاشکرا پێچەوانەی ئینجیلی لۆقایە، ئەمەش بە ڕاشکاوی شتێکمان پێشکەش دەکات کە لەگەڵ ئەو زانیارییە تایبەتییە نوێیانەدا یەک ناگرنەوە کە تایبەتن بە کۆنیی مرۆڤ لە زەویدا"(13).

2- «"لە سەرەتادا لایەنە زانستییە تایبەتەکانی قورئان دووچاری حەپەسانێکی قووڵیان کردم. چونکە باوەڕم وا نەبوو کە بەم ژمارە زۆرە و هەتا ئەم ڕادەیە باسی تایبەت بەو بابەتانە لە قورئاندا بدۆزمەوە کە زۆر جۆراوجۆرن و، بە تەواوی پڕاوپڕی زانیارییە زانستییە تازەکانن. ئەوەش لە دەقێکدا کە پتر لە سیازدە سەدە پێش ئێستا نووسراوە. لە سەرەتادا هیچ باوەڕێکم بە ئیسلام نەبوو، ڕێی ئەم لێکۆڵینەوەیەشم بە گیانێکی ئازاد لە هەموو بڕیارێکی پێش وەخت و، بە جۆرێکی بابەتییانەی تەواو گرتەبەر"(14).»

3- «"دەستم دایە قورئان و، بە شێوەیەکی تایبەتی لەو وەسفکردنەی قورئان بێدار بوومەوە کە لە بارەی ژمارەیەکی گەورەی دیاردە سروشتییەکانەوە پێشکەشی دەکات. وردیی هەندێ لەو درێژە پێدانە تایبەتەی بە هەندێ لەم دیاردانە، سەرسامی کردم! ئەم درێژەپێدانانەش لە دەقە ئەسڵییەکەدا نەبێت نازانرێن. سەرسامییەکەم لە یەکاویەک بوونی ئەم زانیارییانەدا بوو بۆ ئەو چەمکانەی کە ئەمڕۆ سەبارەت بەم دیاردانە هەمانە و، هەرگیز بۆ مرۆڤێکی سەردەمی محەممەد ﷺ نەڕەخساوە کە بچووکترین بیرۆکەی لە بارەیانەوە هەبێت"(15).»

4- «"چۆن دەگونجێ مرۆڤێک کە هەر لە سەرەتاوە نەخوێندەوار بووە بە ڕاشکاوی لە چەندین ڕاستیی ئەوتۆ بدوێت کە مۆرکی زانستییان پێوەیە و، لە توانای هیچ مرۆڤێکی ئەو سەردەمەدا نەبووە ئەو زانیارییانە بۆخۆی پێک بهێنێت، بێ ئەوەی کە ئەو لێدوانە ڕاشکاوانەی ئەو، بچووکترین هەڵەی لە ڕووی زانستەوە تێدا دەربکەوێت؟"(16)!»

(13) قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زانست، لاپەڕە: 13.
(14) هەمان سەرچاوە، ل: 144
(15) هەمان سەرچاوە، ل: 145
(16) هەمان سەرچاوە، ل: 150.




# زانستە شاراوەکانی ئیسلام /١

وەرگێرانی :هاوژین طالب
hawzhin@gmx.com

ئەم بابەتە بریتیە لە بەرنامەیەکی دۆکۆمێنتاری بە ناوی (جیهانی موعجیزەکان welt der wunder)، کە پێشکەشکاری بەناوبانگی ئەڵمانی (هێندریک های Hen-drik Hey) لە کەناڵی (RTL 2) پێشکەشی کرد، (های) سێ ئەڵقەی ئەو بەرنامەیەی تایبەت کرد بە مێژوی زانستی موسڵمانان و ناوینا (زانستە شاراوەکانی ئیسلام)، وە لەبەر گرنگی بابەتەکە دوای وەرگێرانی بۆ زمانی کوردی و ژێرنوسکردنی، پێمان باش بو بۆ سودی زیاتر وەک بابەتێک لە گۆڤاری (هەیڤ)دا بڵاویبکەینەوە، بۆ بینیی ڤیدیۆ ژێرنوسەکەش دەتوانرێت سەردانی ئەم لینکە بکرێت..
https://www.youtube.com/watch?v=ZkUkdB7uhz4

لەم بەرنامەیەدا ئەو ڕاستیە ڕون دەبێتەوە کە موسڵمانان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە هەمو بوارەکانی زانستدا لە پێشەوە بون و زانست و پێشکەوتنیان بە دەستەوە بوو، وە ئەو زانستەی ئەمڕۆی جیهانی مەسیحی سەرچاوەکەی بەرهەمی زانستەکانی ئیسلامە..



(های) لە پێشەکی ئەڵقەی یەکەمی بەرنامەکەیدا دەڵێت: «ئەو کات ئەوروپا بە سەردەمی تاریکیدا تێدەپەڕی و سەرانی کەنیسە پێ یان وابوو ئەو پێشکەوتنەی موسڵمانان لە شەیتانەوە سەرچاوەی گرتوە، هەروەها ئەو زانستەی ئەمڕۆی ئەوروپا سەرچاوەکەی بەرهەمی زانایانی ئیسلامە، بەڵام ئەوان توانیویانە بیان دزن و بیان شارنەوە و ئاماژە بە سەرچاوەکانیشیان نەکەن».. هەروەها بەرنامەکەی بە بەڵگەوە ئاستی شارستانی موسڵمانان و دڕندەیی و نەزانی خاچ پەرستەکانی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و، چەندین باسی سەرنج ڕاکێشی لە بارەی مێژوی موسڵمانان لەسەر زاری چەندین زانا و شارەزای ئەڵمانی خستە ڕوو، کە هەوڵدەدەین هەر سێ ئەڵقەی بەرنامەکەی لە سێ بابەتدا بۆ خوێنەری کورد کورت بکەینەوە.. واتە ئێمە لەم بابەتەدا ناوەڕۆکی بەرنامەکە وەک خۆی وەردەگێڕین و هیچ سەرنجێکی خۆمانی لەسەر نانوسین

## هەزار ساڵ لەمەوبەر زانست لە دەستی مسوڵماناندا بوو:

لە سەرەتای بەرنامەکەدا، (هێندریک های) دەڵێت: "جێی سەرسوڕمانە لە قوتابخانەکانماندا بە دەگمەن باسی چاکەی کلتوری عەرەبی بەسەر ئەوروپا وە دەکرێت.." هەزار ساڵ لەمەوبەر لە سەرەتای جەنگە توندەکانی نێوان مەسیحیەکان و موسڵمانان لەسەر قودس سیستمێکی نوێی جیهانی دەرکەوت، کە لەو سەردەمەدا زانیاری تەکنیک و کارامەیی لە دەستی مسوڵماناندا بوو، بە شێوەیەکی زۆر پێشکەوتو تر لە ئەوروپیەکان.. بە نمونە لەو سەردەمەدا بەکارهێنانی شتێک کە لە دوربین دەچو هەروەها کاژێری چاک لە لای موسڵمانان شتێکی ئاسایی بو.. لە کاتێکدا مەسیحیەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان پەنایان دەبرد بۆ سیخوڕی کردن و، کەنیسە پێی وابوو ئەو پێشکەوتنەی موسڵمانان تەنها ئیشی شەیتانە و، تەنانەت ڕق و کینەیان لە شارەزایی پزیشکیی ئیسلامیش دەبوەوە.. سەرانی کەنیسە بۆ سەدان ساڵ بەڵکو هەتا ئەمڕۆش ئەو زانستانەیان شاردەوە..




مێژونوس تۆماس شویتس (Thom-as Schuetz) دەڵێت: "شاردنەوەی زانستەکانی ئیسلام لەوانەیە هۆکەی ئەوەبێت کە مێژوو سەرکەوتوو دەینوسێتەوە، لە سەدەی ناوەڕاستدا ئەو قەشانە مێژویان دەنوسیەوە دەمارگیربون بۆ ئاینی مەسیحی و بە لاتینی قسەیان دەکرد، ئیسلامیان وەک دوژمن سەیردەکرد و پێ یان وابوو ئیسلام شەیتانە."

بەرنامەکە باس لەو سەردەمە دەکات کە لە ساڵی 1187ز گیروگرفتی نێوان موسڵمانان و مەسیحیەکان گەیشتە لوتکە، یەکەم جار بوو سوپایەکی ئیسلامی ژمارە گەورە کۆببێتەوە و، ئامادەبێت بۆ جەنگێکی

توند و یەکلاکەرەوە دژی خاچپەرستەکان.. سەرکردەی موسڵمانان سوڵتان سەلاحەدین بوو کە سەرکردەیەکی پێشکەوتوو بوو، پێی وابوو ئیمان بە تەنها سەرکەوتن دروست ناکات، بەڵکو دەبێت نەخشە و پێشکەوتنی زانستیشی لەگەڵدابێت، کە ئەوەش ئەوکاتە تێڕوانینێکی ئاسایی هەموو فەرمانڕەوا موسڵمانەکان بوو.

**ئیسلام مەنهەجی عەمەلی و داهێنان بو:**



ڕۆژهەڵاتناس پرۆفیسۆر (فوات زێتسگین Fuat Sezgin) دەڵێت: "ئەو دینە تازەیە هانی بۆ زانست دەدا، پاڵپشتیی خەڵکیی بۆ داهێنان دەکرد، لە ئەنجامی ئەوەشدا خەڵکێکی داهێنەری دروستکرد، توانی دارتاش و شوانی وشتریش بکاتە زانا."

لەکاتێکدا موسڵمانان بە نەخشە و سیستەم جەنگیان دەکرد و، دڵنیابون لە سەرکەوتن، متمانەیەکی تەواویان بە تواناکانیان هەبوو بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هێزی گەورەی خاچپەرستان، ئەو کاتە ئەوروپییەکان متمانەیان بە فیکرەیەک هەبو کە پێیان دەوت چینی فریشتە و، پشتیان بە دەمارگیریە دینیەکەیان دەبەست.. سەرکردە خاچپەرستەکان بۆ دروستکردنی ویستی سەرکەوتن لەناو سەربازەکانیاندا پشتیان بە مەشق کردن لەسەر جەنگکردنی بێبەزەیانە دەبەست.. هەر بەو توندوتیژیەش توانیان نزیکەی سەد ساڵ دەست بەسەر شاری پیرۆز (قودس) دا بگرن.

لە سەرەتای (یولیو)ی ساڵی 1187ز دوو سوپا زۆر گەورەکە بەیەکگەیشتن، لە کاتێکدا کە ئەوروپییەکان (فەرنجەکان) لە (سەفوریە) خێوەتگایان هەڵدابوو، موسڵمانانیش لە نزیک (تەبەریا) ڕێگەی (ناسیرە)یان گرت، لەلای (حوتین) لە نێوان هەردو خێوەتگاکەدا جەنگە یەکلایکەرەوەکە ڕویدا. لەم کاتە ترسناکانەدا زانا موسڵمانەکان دەستیان لە ئیش هەڵ نەدەگرت و بەردەوام بوون لە پێشکەوتنە تەکنیکیەکەیاندا بەسەر فەرەنجیەکاندا، بە نمونە موسڵمانان جۆرە قفڵێکی تازەیان بۆ داخستنی سندوقەکانیان بەکار دەهێنا کە بە کلیل نەدەکرایەوە، کە زانای ئیسلامی (الجزری) لە سەدەی 12ی زاینیدا یەکەم قفڵی خەزێنەی لە جیهاندا داهێنا.




کارمەندی پسپۆڕ (لوتس کۆتهۆف- Lutz kotthof) باسی قفڵەکە دەکات و دەڵێت: "قفڵەکەی (جەزەری) کە لە دەستوخەتێکی سەدەی دوانزەی زاینیدا نوسراوە وەرگیراوە و، پێک هاتوە لە 4 کلیلی ئاڵۆز لەگەڵ 12 پیتدا، مرۆڤ بۆ قفڵکردنی ئەم سندوقە پێویستی بە کلیل نیە، تەنها شێوازی تەرکیبەکەی لەبەر دەکات، ئەگەر کەسێک تەرکیبە ڕاستەکەی دۆزیەوە کە تەواو گونجا لەگەڵ تەرکیبەکەی ژێرەوەی، ئەوا ئەڵقەڕێزە داخراوەکە دەکرێتەوە."

**خواپەرستی هاندەر بوو بۆ پێشکەوتنی زانستی:**

مێژونوس تۆماس شویتس (Thomas Schuetz) دەڵێت: "ئەوەی وای کرد زانستەکان پێش بکەوێت و زانایانی موسڵمان داهێنانی سەرنجراکێش بکەن، ئەوە بوو کە موسڵمانان پێشکەوتنە زانستیەکانیان ئەوەی ئێستا ئەوروپا بە زانستەکان ناوی دەبات بەکار دەهێنا بۆ سەرخستن و بڵندکردنەوەی ئیسلام و، تا خواپەرستیەکانی ئیسلام بە باشترین شێوە پەیڕەوی بکرێت."

شەیدابونی زانست وای لە کارامە موسڵمانەکان کرد، پەرە بە ئامێری زۆر ورد بۆ پێوانی کاتەکان بدەن، بۆ نمونە ئەو کاژێرەی کە (الجزری) دروستیکرد، کاژێری کاس لە سەدەی 12ز، ئەو کارەی پەرەپێدان بو بە کاژێری لمی ناسراو بەڵام لەبری لم، ئاوی بەکارهێناوە، ئەم کاژێرە دیزاینێکی فەخمی هەبوو، مێژونوس تۆماس شویتس (Thomas Schuetz) دەڵێت: "ئەمەش تەنها لەپێناو پێوانی کات بەوردی نەبوو بەڵکو لە وڵاتی موسڵماناندا پەرە بە کاژێرەکان دەدرا لە پێناو پارێزگاریکردن لە کاتەکانی نوێژ، کە ئەوەش بە یەکێک لە نیشانەکانی تەقوا و لە خواترسانی فەرمانڕەوا دادەنرا، لەلایەکی تریشەوە بێگومان بۆ دەرخستنی خۆشگوزەرانی بوو، ئەو کاژێرانە تا ئێستا نەماونەتەوە، بەڵام لە ڕاپۆرتە نوسراوەکانەوە دەزانین کە زۆر جوان و نەخشانیی بون."

نەک تەنها لە بواری میکانیکا بەڵکو توێژەرەوە موسڵمانەکان توانیان لە بوارەکانی تریشدا پێشکەوتنە پێشەنگەکانیان بسەلمێنن.. زانای بەناوبانگ (ابن الاثیر) دەڵێت: "لە مامۆستا کەمەوە فێربوم کە شوشەی سافکراو بینینی چاو بەهێز تر دەکات و یۆنانیەکان پێش سەدان ساڵ لەمەوبەر لێکۆڵینەوەیان لەسەر چۆنیەتی ئیشی چاوکردوە."



زانا (ابن الهیثم) لەسەدەی 11 ز دا پەرەی بە لێکۆڵینەوە یۆنانیەکان داوە و ئەوەی بەرهەمهێنا کە شوشەی سافکراو بۆ گەورەکردن و باشکردنی هێزی بینینی چاو بەکاردێت.

(ابن الاثیر) دەڵێت: "پرسیم لە مامۆستاکەم کە ناوی (بهاء الدین) بوو: "خەریکە بڕوا بە پێشکەوتنی گەورەی زانستیمان بەسەر توێژەرەوەکانی تردا نەکرێت، بەڵام هێشتا جەنگاوەرەکانمان لە جەنگەکەیاندا لە دژی فەرەنجیەکان کەڵکیان لێ وەرنەگرتوە، بۆچی هەتا ئێستا بەسەر فەرەنجیەکاندا لە جەنگێکی یەکلاکەرەوەدا سەرنەکەوتوین؟ مامۆستاشم لە وەڵامدا وتی: "یەکنەبونی گەلانی ئیسلامی لەناو خۆیاندا و ململانێکانیان هەرماوە تا ماوەیەک نەیدەهێشت سوپایەکی بەهێزی لێدەرکۆبکرێتەوە، بەڵام لە سەردەمی سوڵتان سەلاحەدیندا بارودۆخەکە گۆڕاوە، ئەو لە یەکخستنی مسوڵماناندا سەرکەوتوو بووە."

سەرەتای سەردەمێکی نوێ: دزینی زانستەکانی ئیسلام لەلایەن خاچپەرستانەوە:

له 4 ی یولیوی ساڵی 1187ز جەنگی (حوتین) ڕویدا و موسڵمانان له جەنگدا تەکنیکێکی سەرکەوتویان بەکارهێنا و گەمارۆی لەشکری فەرەنجیان دا کە فەرەنجیەکان خۆیان بۆ نەخشەی وا ئامادە نەکردبوو، بۆیە بە خێرایی تەسلیم بون و جەنگەکەیان دۆڕاند.. بە شکانیان لە (حوتین)دا خاچپەرستان قودسیان دۆڕاند و بەشی هەرە گەورەی سوپاکەشیان تێکشکا، بەوەش بەرگریکردن لە قودس مەحاڵ بوو، بەم شێوەیە لەدوای 100 ساڵ، سوڵتان سەڵاحەدین کۆتایی بە دەسەڵاتی مەسیحیەکان بەسەر شاری پیرۆزدا هێنا، وە ڕێی بە دانیشتوانە مەسیحیەکان و پاشماوەی جەنگاوەرەکان دا بە سەلامەتی قودس بەجێ بهێڵن..

له کۆتایی ئەم ئەڵقەیەدا بەرنامەکە پێی وایە کە ڕاستە خاچپەرستەکان جەنگەکەیان دۆڕاند و شاری (قودس)یان لە دەستدا بەڵام ئەوەی (سوڵتان سەڵاحەدین ) ئاگاداری نەبوو، ئەوە بوو کە سەرکەوتنەکەی بوە هۆی سەرەتای دەرکردنی زانستە عەرەبیەکان بۆ خاکی ڕۆژئاوا واتە سەرەتای سەردەمێکی نوێ دەستی پێکرد کە ئەویش دزینی زانستەکانی زانا موسڵمانەکان بو لەلایەن خاچپەرستەکانەوە کە دواتر بووە بەردی بناغەی ئەو پێشکەوتنە زانستیەی لە ئەوروپادا بەرپابوو، کە تا ئێستاش مەسیحیەکانی ئەوروپا ڕاستی سەرچاوەی زانستە تازەکانیان لە نەوەکانیان دەشارنەوە.



وێنەی سەربازگەی (سوڵتان سەڵاحەدین) دوای جەنگی (حوتین)

سەرچاوە:

https://www.youtube.com/watch?v=79R9azF1mig

# ئەسپسواری بۆ منداڵان

و: سازگار عثمان



لە لێکۆڵینەوەیەکی ساڵی 2014 دا دەرکەوت کە ئەسپسواری زۆر بەسوودە بۆ منداڵان. چونکە بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی زانکۆی واشنتۆن ئەم جۆرە وەرزشە هۆڕمۆنی (ماندوبون - الاجهاد) لەلای منداڵ کەمدەکاتەوە. وە لێکۆڵینەوەکە جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی ئەسپسواری بۆ منداڵان متمانە بە خۆبوونی زیاتریان پێ دەبەخشێ و کەسایەتیان بەهێزدەکات و ڕێگری لە گەشەکردنی کێشە تەندروستی و دەروونیەکان دەکات..

دەشکرێت نەخۆشی (هەستکردن بە تەنهایی - التوحد) چارەسەر بکات و بەهەمان شێوەش دەکرێت ببێتە چارەسەر بۆ نەخۆشی (ڕەبو) و هەندێ نەخۆشی درێژخایەن.

لێکۆڵینەوەکانی پێشتر جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەسپسواری دژی خەمۆکی و هەستکردن بە (ڕێزگرتن لە خود) زیاد دەکات میزاج باشدەکات و دڵەڕاوکێ کەمدەکاتەوە..

هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان دڵنیامان دەکەنەوە کە ئەسپسواری بەپێی بەرنامە (بەڕێک وپێکی) پەستانی خوێن دادەبەزێنێت و یارمەتیدەرە بۆ چارەسەرکردنی خەو زڕاندن و تێکچوونەکانی خەوتن لەلای منداڵان...

دەگێڕنەوە لەسەر زاری گەورەمان (عومەری کوڕی خەتاب) خوای لێ ڕازی بێ کە فەرمویەتی: (منداڵەکانتان فێری مەلەکردن و تیرهاویشتن و ئەسپسواری بکەن)،خۆشەویستیشمان محمد دەفەرموێت: (الخيل فی نواصيها الخير الى يوم القيامه) واتە: (ئەسپ بەناوچاویەوە خێرگرێدراوە هەتاکو ڕۆژی دوایی) (موسلیم گێڕاویەتەوە).

چارەسەر بەئەسپسواری جۆرێکە لە جۆرەکانی سوود (جۆرەسوودێکە) کەبەم دواییانە دەرکەوت و کەس پێشتر پێی نەزانیبوو....

kaheel7.com

# ئیعجازی قورئان

## له بەکارهێنانی پۆزەتیڤ کۆنترۆڵ و نێگەتیڤ کۆنترۆڵ

د.پێشنیار محمد عطا رشید/ ماستەر لە Molecular Genetics

کۆنترۆڵ یەکێک لە چەمکە زانستیەکانی بە مانای دڵنیایی دێت وەک چۆن دەڵێین کوالیتی کۆنترول واتە (دڵنیایی جۆری).
لە کاتی توێژینەوە دا بۆ سەلماندنی ئەو ئەنجامانەی بەدەست دەهێنرێن پێویستە دوو کۆنترۆڵ دابنرێت یەکێکیان پێی دەوترێت پۆزەتیڤ کۆنترۆڵ ئەوەی تر پێی دەوترێت نێگەتیڤ کۆنترۆل. بۆ نمونە ئەگەر لەتوێژینەوەیەکدا بتەوێت بیسەلمێنیت کە کەسێک توشی نەخۆشی ڤایرۆسی بوە پێویستە بێجگە لەو کەسەی پشکنینەکەی بۆ دەکرێت دوو نمونەی تریش پشکنینی بو بکرێت یەکێکیان کە بەدڵنیایەوە ڤایرۆسەکەی تێدا نی یە (نێگەتیڤ کۆنترۆڵ) وە پێویستە ئەنجامی پشکنینەکە نێگەتیڤ بێت. وە ئەوەی تریشیان بەدڵنیایەوە ڤایرۆسەکەی تێدا هەیە (پۆزەتیڤ کۆنترۆڵ) وە دەبێت ئەنجامەکەی پۆزەتیڤ بێت، گرنگی ئەم دو کۆنترۆڵە لەوەدایە ئەگەر پشکنینی نەخۆشەکە ئەنجامەکەی نێگەتیڤ بوو بە بەرامبەرەکەت دەسەلمێنیت کە ئەو ئەنجامە بە هۆی بێ کەڵکی جۆری پشکنینەکەوە یان نەشارەزایی خۆتەوە نی یە، بە بەڵگەی ئەوەی کە یەکێک لە کۆنترۆڵەکان پۆزەتیڤ بوە. بە پێچەوانەشەوە ئەگەر پشکنینی نەخۆشەکە ئەنجامەکەی پۆزەتیڤ بوو ئەوا بە بەرامبەرەکەت دەسەلمێنیت کە ئەو ئەنجامە بە هۆی تێکەڵ بونی مەوادی تاقیگەکەتەوە نیە لەگەڵ خوێنی کەسێکدا کە پێشتر پشکنینت بۆ کردوە، بەڵگەش بۆ ئەوە نێگەتیڤ کۆنترۆڵە کە هەر بە نێگەتیڤی ماوەتەوە. کەواتە گرنگی سەرەکی پۆزەتیڤ کۆنترۆڵ و نێگەتییڤ کۆنترۆڵ لەوەدایە تا وەک بەڵگەیەک بەکار بهێنرێت بۆ بڕوا هێنانی کەسی بەرامبەر بەو دەرئەنجامە. هەر بۆیە لە هەموو پشکنینە تاقیگەییە پیشکەوتوەکانی سەردەم و لە هەموو توێژینەوەکان و هەموو ئەو بابەتە زانستیانەی کە لە نامەی ماستەر و دکتۆرادا پێشکەش دەکرێت لە زانکۆکانی جیهاندا پێویستە ئەم کۆنترۆڵانە بەکاربهێنرێت. بە پێچەوانەوە لیژنەی هەڵسەنگاندن و کەسانی بەرامبەر هیچ نرخێک بۆ دەرئەنجامەکان دانانێن و تانەی لێدەدەن.
ئەم بەڵگە هێنانەوەیەی کە لە زانستی پێشکەوتودا پەیڕەو دەکرێت وەک یەکێکی تر لە ئیعجازەکانی قورئان وایە کە پێش زیاتر لە هەزارەیەک پێش ئێستا خوای گەورە لە باسی چیرۆکی پێغەمبەرێکدا بۆمان دەگێرێتەوە کە دەفەرموێت:﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾ ﴾ البقرە، واتە (یاخود وەک ئەو کەسەی تێپەڕی بەلای شارۆچکەیەکدا کە هەمو خانوەکانی بەسەر سەقفەکانیدا تەپی بون، لەبەر خۆیەوە وتی: ئاخۆ خوای گەورە چۆن خەڵکی ئەم شارۆچکەیە دوای مردنیان زیندو دەکاتەوە؟! (ئەو کەسە عوزەیر بوو یەکسەر خوای گەورە سەد ساڵ مراندی و پاشان



زیندوی کردەوە و پێی فەرموو: چەند مایتەوە؟ (عوزەیر) وتی: ڕۆژێک یان کەمتر لە ڕۆژێک ماومەتەوە، (خوا) فەرموی: نەخێر ئەوە سەد ساڵت پێچوە، جا تەماشای خواردن و خواردنەوەکەت بکە (لەو ماوە درێژەدا) نەگۆڕاوە و تێک نەچوە، تەماشای گوێدرێژەکەشت بکە، (بۆیە ئەمەمانکرد) تا بەم بەسەرهاتە بتکەینە موعجیزە بۆ خەڵکی، جا سەیری ئێسکەکانی (گوێدرێژەکەت بکە) چۆن بەرزیان دەکەینەوە و بەیەکەوەیان دەبەستین و پاشان بەگۆشت دایاندەپۆشین، کاتێک بینی و بۆی دەرکەوت وتی: چاک دەزانم و دڵنیام بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە (تەفسیری ئاسان).
بەم شێوەیە خوای گەورە بۆ ئەوەی بۆ پێغەمبەرەکەی بسەلمێنێت کە سەد ساڵ مراندویەتی دوو بەڵگەی بۆ دادەنێت وەک کۆنترۆڵ. یەکەمیان ئەوەی کە خواردن و خواردنەوەکەی هێشتا نەگۆڕاوە و تازەیە ئەوەش وەک و نێگەتیڤ کۆنترۆڵ وایە کە بۆ ئەوەی پێی پیشان بدات کە خۆی و خواردنەکە پێکەوە زیندوو کراونەتەوە یان تێپەڕبونی کات بەسەریاندا کاریگەری نەبوە، وە بەڵگەی ڕزینی لاشەی گوێدرێژەکە و مانەوەی ئێسک و پروسکەکەی وەک پۆزەتیڤ کۆنترۆل وایە تا بۆ پێغەمبەرکەی بسەلمێنێت کە سەد ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ڕوداوەکەدا. بەم جۆرە بۆ سەلماندن و باوەڕ هێنان بەو دەرئەنجامە کە بەسەریدا هاتوە ئەوا عوزەیر خۆی لە نێوان دوو کۆنترۆڵ یان دوو بەڵگە بەراورد دەکات تاکو ڕاستی ڕوداوەکەی بۆ دەر بکەوێت و دڵنیا بێتەوە. دەنا خوای گەورە تەنها بەڵگەی زیندوکردنەوەی گوێدرێژەکە بەس بو تا پیشانی پێغەمبەر عوزەیر بدات.
ئیعجازی قورئان لەم بابەتدا لەوەدا دەردەکەوێت قورئانی پیرۆز پێش زیاتر لە 1435 ساڵ کە باس لەو ڕوداوە دەکات کە چەندین سەدە پێش هاتنی پەیامی پێغەمبەر محمد ﷺ ڕویداوە هەر هەمان ئەو کەرەسە و بەڵگانە بەکاردەهێنێت کە ئێستا لە تازەترین توێژینەوەکانی سەردەم بەکاردێت بۆ سەلماندنی ئەنجام و بەڵگەکان. گرنگی ئەم بابەتەش لەلای توێژەوەرانی بابەتە زانستیەکان و زاناکان بە ڕوونی هەستی پێدەکرێت چونکە ئەوان زیاتر هەست بە گرنگی دانانی کۆنترۆڵ دەکەن بۆ سەلماندن و بڕواپێهێنانی ئەنجامەکان.



# له بەناوبانگترین زاناکانی جیهان پرۆفیسۆر (کیث مور)

وەرگێرانی :ناسک ئیسماعیل عزیز

پرۆفیسۆر دکتۆر (کیس مۆر)، پرۆفیسۆری زانستی توێکاری و کۆرپەلەزانی لە (زانکۆی تۆرنتۆ) لە کەنەدا، ئەم زانایە پلە بە پلە گەیشتۆتە ئەم ئاستە لە چەندین زانکۆدا لەوانە زانکۆی (توینابێک) لە خۆرئاوای کەنەدا بۆ ماوەی (11) ساڵ، پاشان چەندین ساڵ سەرۆکی بەشی کۆرپەلەزانی و توێکاری بوە لە (زانکۆی تۆرنتۆ). سەرۆکایەتی چەندین کۆمەڵەی نێودەوڵەتی کردوە، بۆ نمونە کۆمەڵەی زاناکانی توێکاری و کۆرپەلەزانی لە کەنەدا و ئەمریکا، هەروەها ئەنجومەنی یەکێتی زیندەوەرزانی، هەروەها ئەندامە لە کۆمەڵەی پزیشکی مەلەکی کەنەدا و لە ئەکادیمیای نێودەوڵەتی خانەزانی و، لە یەکێتی ئەمریکا بۆ پزیشکەکانی توێکاری و، ئەندامیشە لە یەکێتی دوو ئەمریکا کە لە بەشی توێکاریدا. دانەری چەندین پەرتوکە، کە هەندێکیان لە بواری توێکاری ئیکلینکی و کۆرپەلەزانیدایە، هەشت پەرتوکی هەیە بەسەرچاوەی قوتابی کۆلێژە پزیشکیەکان دادەنرێن کە بۆ (شەش) زمان وەرگێراون (ئیتاڵی – ئەڵمانی – پورتوگالی – ئیسپانی – یۆنانی – چینی).

دانەری پەرتوکی (قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤ)ە، کە بۆ زیاتر لە (هەشت) زمان وەرگێردراوە: (ڕوسی – ژاپۆنی – ئەڵمانی – چینی – ئیتاڵی – پورتورغالی – ئینگلیزی – یوغۆسلاڤی).

مامۆستا (عەبدول مەجید زیندانی) دەڵێت: داوای کتێبێکی باوەڕپێکراوم کرد لەبارەی زانستی کۆرپەلەزانیەوە لە (بەریتانیا) ئەوانیش کتێبی (پرۆفیسۆر مور)یان بۆناردم، دیسان داوای کتێبێکی باوەڕپێکراوم کرد بۆ هەمان مەبەست لە (ئەڵمانیا) ئەوانیش هەر کتێبی (کیث مور)یان بۆ ناردم بە زمانی ئەڵمانی.

ئیدی منیش وتم: کەواتە دەبێت (د. مور) لەم زانستەدا پیاوێکی گەورە بێت.

هەروەها (زیندانی) دەڵێت: کاتێکیش هاتم لە ڤیدۆکاندا گەڕام بۆ زانستی کۆرپەلەزانی، 34 فیلمی ڤیدۆم لەو بارەوە دۆزیەوە، کە هەمویان سەرچاوەکەیان بۆ (د. مور) دەگەڕایەوە.

وتم: باشە دەبێت ئەم (د. مور)ە کێ بێت؟

بۆیە ئیتر کەوتمە پرسیار کردن، پرسیارم لە (د. احمد حجازی) کرد، کە مامۆستای زانستی کۆرپەلەزانیە لە زانکۆی (مەلیک عبدالعزیز) لەبارەی (د. مور)ە وە، ئاخۆ ناوی بیستوە؟

ئەویش پێی وتم: ئەوە باوکی زانستی کۆرپەلەزانیە، بەڵێ باوکی زانستەکەیە.

وتم: خوایە گیان کێ دەمگەیەنێتە ئەو پیاوە؟ ئەوە ئەو پیاوەیە کە من بەدوایدا دەگەڕێم.

ئیتر بەو شێوەیە، تا لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی (مەلیک عبدالعزیز)

شەشەم کۆنگرەی پزیشکی بەستراو، نێردراوی شانشینی (سعودیە)ش ماموستا (عصام شێخ) کە ڕاوێژکاری ڕۆشەنبیری شانشین بوو لە (کەنەدا) بانگهێشت کرابو بۆ ئەوێ، منیش خۆم پێناساند و وتم: جەنابتان لە کوێن؟

وتی: من پاشکۆی ڕۆشەنبیری شانشینی سعودیەم لە کەنەدا.

وتم: لەکەنەدایت؟! برام ڕاستیەکەی ئێمە پزیشکێکمان دەوێت لە کەنەدا (دکتۆر مور)ی ناوە.

ئەویش پرسی: لە چ زانکۆیەکە؟

وتم: لە (زانکۆی تۆرینتۆ)، ئەویش وتی: بەڕێوەبەری تۆرینتۆ هاوڕێمە، بە قۆشمەوە وتی: باوکیشیت بۆ دێنم.. وتم: نا باوکیم ناوێت خۆیم بۆ بێنە..

خوایگەورە پاداشتی چاکەی بداتەوە بەپەرۆشەوە گەڕایەوە بۆ (کەنەدا)و، لەوێوە نامەیەکی بۆ ناردم، منیش (دکتۆرمور)م بانگهێشت کرد، کە بێت بۆ زانکۆی (مەلیک عەبدول عزیز)، جەنابیشیان خۆشحاڵبون بە داواکەمان.

ئیتر لە بەر خۆمەوە وتم: ئۆخەیش ئەوە دکتۆرە کە دێت بۆ زانکۆ! پاشان ئەم مژدەیەم دا بە (د. عبدالله عمر عظیم)، ئەویش یەکسەر ڕەزامەندی خۆی نیشاندا و، دو تکتی تەیارەی بۆ (د.مور) و خێزانەکەی نارد و ئوتێلێکی پێنج ئەستێرەی بۆ گرتن و ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی لێ گرتن.

کاتێک بەڕێزیان گەیشتن، هات بۆ لامان و وتی چیتان لایە؟

وتمان: هەندێک پرسیارمان هەیە، ڕاستیەکەی 80 پرسیارمان هەیە لەسەر زانستی کۆرپەلەزانی، بۆ ئەوەش دوو ڕۆژمان بەسەر برد، پرسیارمان لێ دەکرد و بە ڤیدیۆ دەمان گرت، لەوە دەترساین ڕای بگۆڕێت—

دکتۆر لێی پرسین و وتی: من سەرم لەم پرسیارانەی ئێوە سوڕماوە، هەندێکیان منداڵێکی قۆناغی سەرەتایی دەیزانێت! وە پرسیاری واشم لێدەکەن کە تەنانەت گەورەترین زاناکانی ئەم سەردەمە ناتوانن وەڵامی بدەنەوە، بگرە تائێستاش لە ژێر لێکۆڵینەوەدایە، ئەمە مانای چی؟

وتمان: بەڵێ نهێنیەک لە بابەتەکەدایە!!

وتی: بەڵێ چیتان لایە؟

وتم: بڕوانە دکتۆر ئێمە لە مێژوی زانست دەکۆڵینەوە، وە هەرچی یەک لە پێش و لە دوای داهێنانی وردبینەوە دۆزراوەتەوە لێی دەکۆڵینەوە..

وە لەکاریگەری ئەوانە دەکۆڵینەوە لەسەر زانستی کۆرپەلەزانی، ئەوەی پەیوەندی بە پێش داهێنانی وردبینەوەیە، پرسیاری سادەن و وەک خۆت دەڵێیت هی قۆناغی سەرەتاییە، ئەوەش کە پەیوەندی بە دوای داهێنانی وردبینەوەیە، پرسیاری ئاڵۆز و وردن و هێشتا لە ژێر لێکۆڵینەوەدان، ئەویش قسەکەمانی لا پەسەند بو وە بەردەوام بو لەگەڵمان....

پاشان وتمان: دکتۆر! قۆناغی پێش داهێنانی وردبین، ئەو ماوەیە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە، لەو کاتەدا ئایەتەکانی قورئان دادەبەزی و لەبارەی زانستی کۆرپەلەزانی دەدوا، بۆیە ئێمە پرسیارمان لێ دەکرد لەبارەی ئەم ئایەتە و ئەو ئایەتەی تر و بەو جۆرە زانیاری وردی پێدەداین و، سەری دەسوڕما!

وتی: ئەمە سەرسوڕهێنەرە و پاشان چو بۆ لای خێزانەکەی و پێی وت: ئێستا ئەزانم بۆچی بانگکراوم، ئەوانە باسی چەند ئایەتێک لە قورئان دەکەن کە لەگەڵ تازەترین لێکۆڵینەوەکانی ئەمڕۆدا یەک دەگرنەوە!

ئەویش وتی: منیش ئەم کاتەی لە ئوتێلەکەدا ماومەتەوە قۆستومەتەوە بۆ خوێندنەوەی ئەم قورئانە و، ئەم دیو و ئەو دیوم کردوە تا ئایەتێکم بەرچاو کەوت لە بارەی ئیعجازی زانستی لە زانستی کۆرپەلەزانیدا.. خێزانی بە تەنیا بەم کارە هەستاوە.

پاشان، لە دوای ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی داینەوە و لایەنە ئەرێنیەکانمان تیا بەدی کرد، بەجێی هێشتین و ڕۆیشت.. بەڵام بەهۆی ئەویشەوە 40 پرسیاری تری نوێ لە بواری کۆرپەلەزانیدا، لامان سەری هەڵدا.

دیسان نامەمان بۆ نارد: ئاخۆ دکتۆر دەکرێت بێیتەوە بۆ ئێرە؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: بەڵێ دەکرێت، بەڵام بەمەرجێک.. وتمان مەرجەکەت چی یە؟

وتی: وانەیەک پێشکەش دەکەم و دەبێت پزیشک و قوتابیەکانیش گوێیان لێ بێت.

منیش کەوتمە گێژاوی ئەو پرسیارەوە کە ئاخۆ بۆ دەیەوێت وانەیەک پێشکەش بکات؟

ئاخۆ کە گەڕاوەتەوە بۆ کەنەدا سەرزەنشت کراوە؟ ئاخۆ لۆمەیان کردوە؟ و ئێستا داوایان لێکردوە کە ڕابردو بسڕێتەوە!

کەواتە با بێت، ئێمە باکمان نی یە و زانستمان پێ یە و هەر لە شوێنی خۆشی دا وەڵامی دەدەینەوە.. بۆیە وەڵامان بۆ نارد کە: فەرموو بەخێربێن ئێمە ئامادەین.

کاتێک دکتۆر دوبارە هاتەوە بۆلامان، دەستی کرد بە خستنە ڕوی بابەتاکان و وتی من سلایدم دەوێت، ئێمەش یەک بەیەک سلایدەکانمان بۆ ئامادەکرد، فلان سلاید و فلان و فلان و... هتد، بەڵام سەرمان سوڕما لە بابەتی وانەکەی کە شتێکی تر بوو، پێچەوانەی ئەوەی کە خۆمان گومانمان لێدەکرد، وتم: باشە ناونیشانی ئەم وانەیە چی یە، هیچم شک نەبرد جگە لەوەی ناوی لێ بنێم، بەراوردکردنی زانستی کۆرپەلەزانی لەگەڵ ئەوەی لە قورئان و سونەتدا هاتوە.

ئیدی بڵاومان کردەوە کە لە زانکۆی (مەلیک عبد العزیز) وانەیەک لەبارەی بەراوردکردنی زانستی کۆرپەلەزانی لەگەڵ قورئان و سونەتدا پێشکەش دەکرێت لە لایەن پرۆفیسۆر مور)ە وە.

لەبەرئەوەی پزیشکەکان پایە و پێگەی ئەم پرۆفیسۆرەیان باش دەزانی، بۆیە پزیشکەکان هاتن و کەسانی تریش پێکەوە ئامادەبون، ئەویش وانەکەی بە سلاید دەوتەوە و دەیوت: ئەم ئایەتە ئاوا دەڵێت، ئەوەش ڕاستیەکەیەتی کە لە بەرچاودایە سەیری بکەن، ئەمەش ئایەتێکی تر ئەوەش ڕاستیە زانستیەکەی، لە کۆتایشدا وتی، ئەم زانستە شایەتیم بۆ دەدات کە دەبێت لەلایەن خوداوە بێت. هەروەها شایەتیم بۆ دەدات کە (محمد) نێردراوی خودایە، ئیتر خەڵک هەمووی چەپڵەیان لێدا و هوتافیان کێشا و هەژان.

---

سەرچاوە: چاوپێکەوتنێک لەگەڵ عبدالمجید زندانی لە بەرنامەی (صفحات من حیاتی) لە کەناڵی ئاسمانی (المجد)ی سعودیە.

https://www.youtube.com/watch?v=ikdmtU3y-LA



# ئایا مەی لە جەڵتەی دڵ دەمانپارێزێت؟

د. دیاری ئەحمەد ئیسماعیل
پسپۆڕی نەشتەرگەری
diaryismaeil@yahoo.com

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک پرسیاری لێ دەکرێت سەبارەت بە بەکارهێنانی مەی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی؟ لە وەڵامدا دەفەرموێت: ئەوە نەخۆشیە، و شیفای تێدا نیە:

أن طارق بن سويد (رضي الله عنه) سأل النبي ﷺ عن الخمر، فنهاه، أو كره له أن يصنعها. فقال: إنما أصنعها للدواء. قال: «إنه ليس بدواء ولكنه داء» -مسلم (٣/ ١٥٧٣) في كتاب الأشربة، ٣٢- باب تحريم التداوي بالخمر.

هەروەها دەفەرموێت: «إن الله لم يجعل شفاء أمتي فيما حرم عليها» أبو داود، وأبو يعلى، والبزار، وصححه إبن حبان.

هەروەها دەفەرموێت: «إن الله خلق الداء والدواء، فتداووا، ولا تتداوو بحرام» الطبراني: بإسناد رجال ثقات، كما في مجمع الزوائد.

هەروەها دەفەرموێت: «إن الله أنزل الداء والدواء، وجعل لكل داء دواء، فتداووا ولا تتداووا بحرام» أبو داود في سننه (٤/ ٢٠٦- ٢٠٧) كتاب الطب، ١١- باب في الأدوية المكروهة.. السلسلة الصحيحة (برقم ٦٠٣٣)-.

خوای گەورە نەخۆشی و دەرمانەکەشی دروست کردووە.. ئێمەی مرۆڤ فەرمانمان پێکراوە بە دوای ڕێگە چارەکاندا بگەڕێین، کە بێگومان بوونیان هەیە، و لە خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵیشدا دەست دەکەون، ئەگەر بیدۆزینەوە.. بەڵام پێدەچێت، لە کاتی ونیی ڕێگە چارە حەڵاڵەکە، ناچارمان کات هەندێک خواردن و خواردنەوە و ماددەی حەرامکراو بەکار بێنین لە چارەسەرەکانماندا، بەڵام دەبێت بە ڕێژەی خۆی بێت و زیادەڕەوی تێدا نەکرێت.. لەگەڵ ئەوەی وا هەست دەکرێت دەستەوسانی ئێمەی مرۆڤ بێت کە ڕێگە چارە حەقیقیە حەڵاڵەکەمان دەرک پێ نەکردبێت..

## ئایا نابێت خۆراک و خواردنەوەی قەدەغەکراو (حەرام) بەکاربهێنرێت وەک دەرمان؟

دیارە زانایان لە مێژەوە ئاماژەیان بەو پرسە داوە، و قسەی زۆریان لەسەر کردووە.. لەگەڵ بوونی هەندێ جیاوازی وردەکاریی لە بۆچوونەکانیاندا، بەڵام پێدەچێت لە کۆتاییدا لەسەر ئەو خاڵە، تا ڕادەیەک، بۆچوونیان نزیک بێت: کە ئەگەر خواردن و خواردنەوەی قەدەغەکراویش بەکار هات دەبێت لە سنورێکی زۆر تەسکدا بێت.. بە نموونە لەم ڕیوایەتەدا پێغەمبەر ﷺ ڕێگە دەدات بە یەکێک لە هاوەڵانی کە ئاڵتون بەکاربێنێت لە تەداوی لوتیدا: عن عجرفة بن أسعد، قال: أصيب أنفي يوم الكلاب في الجاهلية، فاتخذت أنفاً من ورق، فانتن علي، فأمرني رسول الله ﷺ أن أتخذ أنفًا من ذهب -رواه الترمذي وقال حسن-. هەروەها ڕێگەی داوە هەندێک لە پیاوان ئاوریشم بەکار بێنن لەبەر نەخۆشی: رخص رسول الله ﷺ لعبدالرحمن بن عوف والزبير بن العوام بلبس الحرير لحكة كانت بهما) -البخاري ومسلم-.

باسەکەمان لەسەر بەکارهێنانی کحولە وەک چارەسەر، کە خواردنەوەی لە ڕێسای ئیسلامیدا حەرامە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ المائدة. هەروەها خوای گەورە خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵی بۆ ڕوونکردوینەتەوە، تا نەکەوینە هەڵەوە: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ... ﴿١١٩﴾﴾ الأنعام. دیارە لەلایەنی پزیشکیشەوە مەی خواردنەوە زیانی زۆری هەیە، گەرچی وترابێتیش بەکارهێنانی هەندێک لەو جۆرە خواردنەوانە هەندێک سوودی هەیە بۆ تەندروستی -وەک لەناو هەندێکدا باوە- وەک نەخۆشی گورچیلە!

بەکارهێنانی هەر ڕێگەیەک لە ڕێگەچارەکانی پزیشکی دەبێت دوای توێژینەوەی زانستی، و بنکەی زانیاری Data base بێت، و لایەنی چاکە و خراپەی ئەو ماددانە لێی بکۆڵرێتەوە.. کاتێکیش بەکاردێت دەبێت سوودەکانی حەقیقی بن، و زیانەکانی زۆر کەم بن. ئەگینا ئەو کاتە هیچمان بە هیچ نەکردووە ئەگەر ماددەیەکی زیانبەخش بەکاربێنین بۆ چارەسەری نەخۆشییەکی ئاسان! بەڵام کاتێک زەروور بوو، بێگومان لەگەڵ زیانە زۆرەکانیشی ناچارین بەکاری بهێنین، بە نموونە: دەرمانە ژەهراوییەکانی نەخۆشییەکانی شێرپەنجە، کە پێشتر پێیان دەوت Cytotoxic drugs واتە: (دەرمانی ژەهراویکەری خانە!)، بەڵام ئێستا پێیان دەوترێت Chemo therapy واتە: چارەسەری کیمیایی!

((هیچ بڕێک لە کحول سەلامەت نییە)).. ئەمە سەربابەتی توێژینەویەکی پزیشکیی فراوانە لە مانگی نیسانی ساڵی 2014دا بڵاوکراوەتەوە، لە لایەن Laura A. Stokowskin, RN, MS. تێیدا هاتووە: «خواردنەوەی بەرپرس[1] Responsible drinking بووەتە ویردی سەر زمانی سەدەی 21، چۆن زۆربەی خەڵکی ئەنواڕنە کحول بەکارهێنان.. بەڵام کاتێک باس لە بوونی بە هۆکاری شێرپەنجە دەکرێت هیچ بڕێک لە کحول سەلامەت نییە»[2]. ئەمە دەرەنجامی

ڕاپۆرتی جیهانیی شێرپەنجە (WCR) (World Cancer Report) بوو، کە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO)/ بریکاری نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوە لەسەر شێرپەنجە IARC بڵاوکرایەوە.

هەروەها لە ساڵی 1988دا ڕاگەیەنراوە کە کحول ماددەیەکی تووشکەری شێرپەنجەیە carcinogen[3].. Jürgen Rehm بەشداربووی WCR، لەسەر بابەتی خواردنەوەی کحول، و زانای گەورەی سەنتەری قاڵبوون و تەندرووستی دەروونی لە تۆرۆنتۆی کەنەدا، دەڵێت: «لە مێژەوە بوو دەمانزانی کە کحول هۆکاری تووشبوونی شێرپەنجەی سوورێنچکە، بەڵام تا10–15 ساڵی دوایی بە تەواوەتی نەماندەزانی چ پەیوەندیەک هەیە لە نێوان کحول و شێرپەنجەکانی تر، وەک شێرپەنجەی مەمک. تەنها لە 10–15ساڵی دواییدا سەرنجی ڕاکێشاین».

## مەترسی مەی خواردنەوە پەیوەندی بە قەبارەی ژەمەکانەوە هەیە:

تا کحول زیاتر بخورێتەوە مەترسییەکان زیاترن.. دۆزراوەتەوە کە پەیوەندی نێوان شێرپەنجە و کحول خواردنەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیە لە هەندێ جۆری شێرپەنجەدا، وەک شێرپەنجەی دەم و گەروو و قورقوڕاگە و سورێنچک و کۆڵۆن و ڕێکە و جگەر و مەمک، هەروەها پەنکریاس و لیوکیمیا و شێرپەنجەی ملی منداڵدان و دەرچە و زێی کۆئەندامی زاووزێی مێینە و پێست[1]. بە ڕێژەیەکی کەمتر پەیوەندی ژەمەکانی خواردنەوەی کحول لەگەڵ شێرپەنجەی گورچیلە دۆزراوەتەوە[2].

## ئایا ڕاستە خواردنەوەی ڕێژەیەکی کەمی کحول نابێتە هۆی توشبوون بە شێرپەنجە؟

لە کۆ توێژینەوەیەک Meta-analysis کە 222 توێژینەوەی لە خۆ گرتووە، و 152000 بەشداربووی لەخۆ گرتبوو، 92000 کەسیان کە بە ڕێژەیەکی کەم کحولیان خواردبۆوە و شێرپەنجەیان هەبوو.. بەڵام 60000 کەسیان نەیانخواردبۆوە و شێرپەنجەیان هەبووە: بینرابوو کە ئەوانەی بە کەمیش دەخۆنەوە مەترسی توشبوونیان هەیە بە شێرپەنجەی دەم و گەروو و سورێنچک و مەمک[3].

لەو کۆتوێژینەوەیەدا دەرکەوتووە: ساڵی 2004 لەسەر ئاستی جیهاندا 5000 حاڵەتی مردوو تۆمار کراوە بە هۆکاری شێرپەنجەی دەم و گەروو، 24000 حاڵەتیش بەهۆی شێرپەنجەی سوورێنچکەوە، و 5000 حاڵەتیش بەهۆی شێرپەنجەی مەمکەوە.. هۆکانیان گەڕێندراوەتەوە بۆ خواردنەوەی ڕێژەیەکی کەمی کحول.. هاوکات تێبینیان کردبوو کەم خواردنەوەی کحول پەیوەندی نەبووە بە شێرپەنجەی کۆڵۆن و ڕێکە و جگەر و قورقوڕاگەوە.

خواردنەوەی کحول بەلای کەمەوە 15 ماددەی شێرپەنجەکەری تێدایە لەوانە: ئەسیت ئەڵدیهایت (Acetaldehyde)، ئەکریلەماید (Acrylamide)، ئەفلادۆکسینەکان (Afladoxins)، ئارسنیک (Arsenic)، بەنزین (Benzene)، کادمیۆم (Cadmium)، ئیسانۆل (Ethanol)، کاربۆناتی ئەسیل (Ethyl Carbonate)، فۆرم ئەڵدیهاید (Formaldehyde)، قورقوشم (Lead)[4].. کاتێک ئەو ماددانە بەر ناوپۆشی گەروو و ناودەم و قورقوڕاگە و سورێنچک دەکەوێت -بەهۆی بەرزی چڕی ئەسیت ئەڵدیهایتەوە- دەبێتە هۆی ئەستوور بوونی ناوپۆشەکەیان (hyperprolifration).. تەنانەت ژەمێکی کەمی کحولیش کە ڕاستەوخۆ بەر ئەو ناوپۆشە دەکەوێت مەترسی تووشبوونی شێرپەنجە زیاد دەکات تیایاندا[5].

لەم دوو دەیەیەی دواییدا هەندێک توێژینەوە دەرکەوت بە تایبەتی لە فەڕەنسا، پێیان دەوترێت (French Paradox)، واتە (ناتەبایی فەڕەنسی)، وەک دژوارییەک لە نێوان ڕاستیە زانستیەکان دەربارەی زیانەکانی کحول، و ئەو بەناو سوودانەی کە بە هۆی خواردنەوەی بەرپرسانەی کحولەوە مرۆڤ دەستی دەکەوێت! بۆیە بەناوی فەرەنساشەوەیە چونکە لە فەڕەنسادا زۆرترین ڕێژەی خواردنەوەی تێدا سەرف بووبوو، بەتایبەتی شەراب.. تیایاندا هاتووە: بە خواردنەوەی ژەمێکی کەم یان مامناوەند لە کحول، بە تایبەتی شەرابی سوور پێش یان کاتی نانی ئێوارە، دەرکەوتووە پارێزگاری لە نەخۆشییەکانی دڵ دەکات.. بینیوبیان ئەو کەسانە کەمتر دووچاری نەخۆشییەکانی دڵ دەبن. هاوکات زیانە زۆرەکانی خواردنەوەی بڕی زۆریان بیرنەچووە ئاماژەی پێ بدەن، وەک بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، و لەرزینی دڵ، و جەڵتەی دڵ و مێشک[6].

بوونی بەڵگە لەسەر زیانە تەندروستیەکانی کحول بەهێزترە لە بوونی بەڵگە لەسەر سوودەکانی.. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ... (٢١٩) ﴾ البقرة. ئەگەر پێبچێت هەندێک سوودی مەی خواردنەوە دۆزرابێتەوە لە لایەنی پزیشکیەوە، ئەوە بێگومان زیانەکانی زۆر زۆرترە، لەوانە تووشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجە-وەک باسمان کرد-.. دۆزراوەتەوە «ڕێژەی (زیان-بۆ-سوود)ی خواردنەوە زیاترە لە تەمەنی گەنجیدا، کە دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی لاشە. ئەمە جگە لە ماکە خراپەکان، وەک ڕووداوی هاتووچۆ، و توندوتیژی، و کێشە کۆمەڵایەتییەکان.. لە ڕاستیدا لەنێوان تەمەنی 15-59 ساڵیدا هەڵسوکەوتە خراپەکان بەهۆی بەکارهێنانی کحولەوە هۆکاری زوو مردنە (premature death)[7].

ماوەتەوە بڵێین خوای گەورە شارەزاترە لەوەی سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت لە مرۆڤ خۆیشی، چونکە خۆی مرۆڤی بەدیهێناوە، و لە هەموو کەس بۆیان باشترە ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ (١٤) ﴾ الملک١٤.

---

1)واتــە خواردنەوەی بڕێکی دیاریکراو لە کحول، بــە قەبارەیەکی کەم، لە چەند کاتێکی دیاری کراوا.

2)Rehm J, Shield K. Alcohol consumption. In: Stewart BW, Wild CB, eds. World Cancer Report 2014. Lyon, France: International Agency for Research on Cancer; 2014.
3)Bagnardi V, Rota M, Botteri E, et al. Light alcohol drinking and cancer: a meta-analysis. Ann Oncol. 2013;24:301-308. Abstract
4)Lachenmeier DW, Przbylski MC, Rehm J. Comparative risk assessment of carcinogens in alcoholic beverages using the margin of exposure approach. Int J Cancer. 2012;131:E995-E1003.
5)Homann N, Kärkkäinen P, Koivisto T, Nosova T, Jokelainen K, Salaspuro M. Effects of acetaldehyde on cell regeneration and differentiation of the upper gastrointestinal tract mucosa. J Natl Cancer Inst. 1997;89:1692-1697.
6)Renaud S, de Lorgeril M. Wine, alcohol, platelets, and the French paradox for coronary heart disease. Lancet. 1992;339:1523-1526.
7)O›Keefe JH, Bhatti SK, Bajwa A, DiNicolantonio JJ, Lavie CJ. Alcohol and cardiovascular health: the dose makes the poison...or the remedy. Mayo Clin Proc. 2014;89:382-393.



# بەکتریای گۆشت خۆر و شزوزی جنسی

ن: د. بەهێز محمدصالح محمود bahezmuhammed@hotmail.com

خوای گەورە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە سەر چەند بنەما و ڕێسایەک دارشتوە کە هەر لادانێک لەو پرۆگرامە کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێر دەبات و بە لەناوچونی خۆیان کۆتایی دێت! بە نمونە کاتێک خوای گەورە باسی نەتەوەی لوط (علیه السلام) دەکات، بە دەست درێژکار و لە سنور دەرچوو ناویان دەبات و، هەڵسوکەوتی ئەوان بە خراپەکاری ەەد ڕەوشتی پێناسە دەکات کە ئەویش شزوزی جنسیە (Homo-sexaulity)، کە هۆکاری سەرەکی نەهێشتنی خێزان و سەر لە بەری بەها مرۆڤایەتیەکانە، لە ڕوی تەندروستیشەوە توشی چەندەها نەخۆشی کوشندەیان دەکات، کە بنبڕکردنیان تاڕادەیەکی زۆر ئاستەمە، هەر لەبەرئەوەشە پێغەمبەر ﷺ دوپاتی کردۆتەوە کە دەبێت هاوڕەگەزبازانی نێر بکوژرێن و تەنانەت سێ جار نەفرینی لێ کردون.

خوای گەورە لە چەند شوێن لە قورئانی پیرۆزدا باسی گەلی لوط (علیه السلام)ی کردوە:

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي
لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ
إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾
وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟
لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ
﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا
عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ
ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾﴾ الشعراء.

لێرەدا دەپرسین بۆچی خوای گەورە کردەوەکانیانی بە کاری خراپ و قێزەون ناوبردوە؟ وە بۆچی پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی لێکردون و فەرمانیداوە بە کوشتنیان، هەرچەندە هەندێک لەم سەردەمەدا بەرگریان لێ دەکەن بەو بیانوەی کە ئەمە جۆرێکە لە خۆشەویستی و لە خانەی هەڵسوکەوتی تایبەتی مرۆڤەکانە و مرۆڤ سەربەستە تێیدا! وە زیانبەخش نیە و بێ مەترسیە و پێویست بە هیچ هەڵایەک ناکات؟ یان هێندێکی دی بە پاساوی ئەوەی نەخۆشن بەرگریان لێدەکەن! ئەم بابەتەش لە ڕوە زانستیەکەیەوە پەردەی لەسەر ئەو مەترسیانە لاداوە کە توشی ئەوانە دێت کە خویان بەو کارە قێزەونەوە گرتوە، بە هیوای وشیارکردنەوەی کەسە شازەکان تا پەشیمان ببنەوە، لەلایەکەی تریشەوە ئەم باسە ڕویەکی ئیعجازی تێدایە تا دامەزراوی بداتە دودڵەکان و لە دو دڵی ڕزگاریان بکات.

مەترسیەکانی ئەم بەدکاریە هەر لە ڕوی جەستەوە نیە، بەڵکو لە ڕوی دەرونیشەوە کاری نەرێی دەکاتە سەر ئالودەبوانی ئەم کارە:

## دارمانی دەرونی:

زانایان ئەوەیان دۆزیوەتەوە کە مادە سپیەکانی ناو مێشک (white matter) دەوری کەناڵی پەیوەندی نێوان خانەکانی مێشک دەبینن، بەڵام لە کەسە شازەکاندا ئەو مادەیە زۆر کەمە، ئەگەر بەرەو کەمتر بڕوات ئەوا دەبێتە هۆی لە دەستدانی ئەو پەیوەندیە، بەوهۆیەوە مرۆڤەکە توشی خەڵەفاوی و (زهایمر) دەبێت، وە ئەوەی ئێستا لە هەندێک وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکادا هەیە لە دروستکردنی خێزان لەسەر شێوەی پێوەندی سێکسی شاز لە نێوان پیاو و پیاو و ژن و ژن، لێکۆڵینەوەکان دەریانخستوە کە ڕێژەی توندوتیژیی لەنێوانیاندا 18 جار زیاترە لە خێزانی ئاسایی، وە ڕێژەی لێدان بە ڕێژەی 30% زیاترە بە پێی زانیاریی ئەم دەزگایە tatistics Canada, Canada›s (National Statistical) Agency, July 7, 2005.)

## ئایدز و بەکتریای کوشندە:

نەخۆشی زۆر هەن لە ئەنجامی شزوزی سێکسیەوە توش دەبن، لە سەرو هەمویانەوە نەخۆشی ئایدز، کە تا ئێستا بە گوێرەی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) لە ساڵی 1981 وە تا ئێستا نزیکەی 35 ملیۆن کەس بەم نەخۆشیە گیانی لە دەستداوە..

لێکۆڵەرەوانیش زۆربەیان لەسەر ئەوە هاوڕان کە زۆربەی ئەوانە لە شازەکان بون...

یەکێکی تر لەو توێژینەوانەی کە لەپێگەی (بی بی سی) و (الجزيرة) دا بینیم و توشی سەرسوڕمان بوم باسی لەو نەخۆشیانە دەکرد، لە سەنتەری پزیشکی ئەمریکی سەلماندویانە، ئەو پیاوانەی کاری نێربازی ئەنجام دەدەن زۆرینەیان توشی زنجیرەیەکی نوێ لە بەکتریای بەرگریکار دەبن کە بەدژە بەکتریا ناسراوە و پێی دەوترێت بەکتریای گۆشت خۆری مرۆڤ! توشبون بەم بەکتریایە لە ناو کەسە شازەکان 13جار زیاترە وەک لە کەسانی دی، وە توشبون بەو جۆرە کە ناسراوە بە (بەکتریای ستافیلو کۆکس ئوریس/ بەرگریکاری دەرمانی میزسلینەکان) دەبێتە هۆی هەوکردنێکی قورس (MRSA) ئەم جۆرە بەکتریایە زۆرترین بەرگری (antibiotic) دژە بەکتریا دەکەن.




توێژینەوەکان زنجیرەیەکی تازەیان لەم بەکتریایە دۆزیوەتەوە کە لە ڕابردودا تە نها لە نەخۆشخانەکاندا هەبوە بەڵام ئێستا بەرگری زۆربەی دژە بەکتریا بەهێزەکان دەکات، کە دەگونجێت بە ئاسانی لە کەسێکەوە بۆ کە سێکی دی بگوازرێتەوە.

یەکێکی دی لەو توێژینەوانەی لەلایەن (دکتۆر بنەدیب)ە وە کراوە کە لێکۆڵەرەوەیە لە مەڵبەندی پزیشکی لە نەخۆشخانەی (سان فرانسیسکۆ) دەڵێت: (زۆرینەی ئەو کەسانەی توشی ئەم بە کتریایە دەبن لە هەندێک شوێن لە پێستیاندا، دەرئەنجامی ئەم کارە شازە و بە تایبەتی لە ناوچەی (کاسترۆ)ن، لە (سان فرانسیسکۆ)ی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە مۆڵگەی شازەکانە).. شایەنی باسە ڕێژەی ئەوانەی توشبون بە شێرپەنجەی پێست لە ناو شازەکان زۆرە، کە ناسراوە بە Kaposi sarcoma تا ئێستاش لێکۆڵینەوە لە سەر ئەم نەخۆشیە دەکرێت کە بە زۆری لە شارەکانی (لوس ئە نجلس و کالیفۆرنیا)دا هەیە..



ئەمە وێنەی بەکتریای گۆشت خۆرە

ئەمەش وای کردوە کە دکتۆرەکان بترسن لە بڵاونەوەی ئەم میکرۆبە بە شێوەیەکی فراوان و بەربڵاو، کە ئەو کاتە زۆر ئە ستەمە ڕێی لێ بگیرێت و کۆنترۆڵ بکرێت و زیانەکانی کەمبکرێتەوە، لە پێگەیەکی سەر بە موحافیزکارەکانی ئەمریکا توشی سەرسوڕمان بون لەوەی کە ئەوانەی بەم جۆرە بەکتریایە دەمرن ڕێژەیان زیاترە لە نەخۆشی ئایدز! هەروەها پێگەی (بی بی سی) بەریتانی کە لە توێژینەوەیەکدا ئاشکرایکردوە جۆرێکی نوێی لە بەکتریای توند کە ناسراوە بە MRSA دەبێتە هۆی توشبون بە هەوکردن و توشبون بە برینی قورس لەسەر سیەکان، کە سەر ئەنجام دەبێتە هۆی خواردن و شی بونەوە و ڕزینی شانەکانی سی. لەگەڵ دروستبونی دومەڵی گەورە لەسەر پێست و خواردنی، لە هەندێ کاتیش دەبێتە هۆی ژەهراوی بونی خوێنی کوشندە.



چۆنیەتی کون کردنی پێست لە لایەن ئەم بەکتریایەوە

وە یەکێک لە پێگە ئەمریکیەکان دەڵێت زۆربەی هاوڵاتیان ئاگاداری ترسناکی ئەم کارە نین، وە پێویستە هاوڵاتیان جیابکرێنەوە بە واتە ئەوانەی بەهۆی (شذوذ)ە وە توشدەبن! وە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی هۆشداری دەداتە ترسناکی ئەو نەخۆشیانە گەر بێت و کۆنترۆڵ نەکرێن لەبەرئەوەی بە دەست لێدانێک لە کەسی توشبوەوە بە ئاسانی دەگوازرێتەوە بۆ یەکێکی دی، هەر لەبەرئەوەیە ڕێکخراوی ناوبراو بە دەیان ملیۆن دۆلار خەرج دەکات بۆ خۆپاراستن لەو نەخۆشیە، بۆ کەسانی بێتاوان کە بەهۆی کاری نێربازی هاوسەرەکانیانەوە توشدەبن یان ئەوانەی لە ڕێی خوێنەوە بۆیان دەگوازرێتەوە.. زۆربەی ئەو نەخۆشیانە بە هۆی لادانی سێکسی دەگوازرێنەوە کە ناسراوە بە sexually transmitted disease (سوزەنک، سیلان، ئایدز، برین و هەڵئاوسانی ئەندامی زاوزێ، ڤایرۆسی جگەر-B، Gental Warts، Genetal Herpes، Chanchroid، Granuloma Inguinalis، Syphilis، Gonorrhea، AIDS، Hepatitis B ) وە هەندێ نە خۆشی دیکە..



وێنەی ڕونکراوەی بۆ شێرپەنجەی تایبەت بە هاورەگەز بازەکان

هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت:«ولم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن في أسلافهم الذين مضوا" رواه الحاكم في مستدركه عن عبد الله بن عمر، و صححه السيوطي، و قال الألباني حديث صحيح.

واتا: لە هەر کۆمەڵگایەک بەرەڵایی سێکسی بەبێ شەرمانە بڵاوبوەوە و بوو بە دیاردە، ئەوا نەخۆشی و پەتای کوشندە تیایاندا بڵاودەبێتەوە کە پێشتر نەبوە لە نێویاندا. وە خێرا بڵاوبونەوەی ئەم نەخۆشیانە بەهۆی ئالودەبون بە پێوەندیە سێکسیە نادروستەکان بەڵگەیەکی ڕونی دیکەیە لەسەر پێغەمبەرێتی محمد ﷺ

رِوی ئیعجاز:

خوێنەری بەڕێز.. ئەوەی لە پێشەوە باسمانکرد ئەوەیە کە لەم سەردەمەدا مرۆڤەکان دوای لێکۆڵینەوە و گەڕان مەترسی ئەو کارە قیزەونەیان بۆ دەرکەوتوە بە پشت بەستن بە زانست و تەکنۆلوجیای تازە، وە لەناو خەڵکانێکدا کە زۆربەیان بێ دینن و بگرە زۆربەشیان بەهیچ ئاینێکەوە پابەند نین.. دەرئەنجامی ڕەفتاری (شاذ)ی نامرۆڤانەی لە ڕیز دەرچوی فیترەتی مرۆڤایەتی دەبینن کە چۆن ڕاستەوخۆ لێیان دەردەکەوێت بە جۆرێک مەترسیەکانی ناشاردرێنەوە و هیچ پاساوێک نیە ببێتە بەرگریکار بۆ برەودان یان ڕێگە ئاسانکردن بۆ ئەو ڕەفتارانە. خۆ ئەگەر لەژێر هەر ناو و پاساوێکدا بکرێت ئەوا پاشینەی باش نابێت و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دوور نیە دوچاری نەهامەتیەکی گەورە نەکاتەوە.. ئەمە لە دونیادا خۆ لە قیامەتیشدا وەزعیان لەوە باشتر نابێت هەروەک خوای گەورە ئاگاداری کردونەتەوە، خۆ ئەگەر لە دەرئەنجامەکانی ئەو نەخۆشیە کوشندانەوە سەیری ئەم هەڵسەکەوتە ناشرینە بکەین ئەوە هەرگیز هیچ خاوەن عەقلێک گومانی لە ڕاستی و دروستی ئایەتەکانی خوای گەورە نابێت.

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە گەلی لوط (علیه السلام) چەند سەرکەش و بێشەرمانە و بێ هیچ دو دڵیەک داوای ڕادەستکردنی میوانەکەیان دەکرد تا ئەو کارە بێزراو و ناشرینە لەگەڵیاندا بکەن! ئەوەتا خوای گەورە ئاماژە دەکات بە پاکژی شوێنکەوتوانی پێغەمبەرەکەیان و بە پیسی خراپەکارانی نەتەوەکەی کە هەڵگری نەخۆشی بون بە جۆرێک کە پێوەیان دەرکەوتوە، لە دوو سورەتی جیای قورئانی پیرۆزدا وەک دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾﴾ الأعراف، هە روەها: ﴿وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾﴾ الأنبياء.

ئەو پەندانەی لەم ئایەتە پیرۆزانە وەردەگرین:

یەکەم: شزوزی جنسی یەکێکە لە کارە قێزەونەکان، هەروەک بینیمان چۆن ئەم کارانە دەبێتە بڵاوبونەوەی چەندەها ڤایرۆس و میکرۆبی ترسناک لەگەڵ توشبونی شێرپەنجە، شوێنکەوتوانی لوط (علیه السلام) بەرنامەی خودایان جێبەجێ دەکرد لە داوێن پاکی و خۆپاکردنەوەدا، سنوری خوای گەورەیان نەدەبەزاند هەر لەبەرئەمە بوو گەلەکەی تۆمەتباریان دەکرد بەوەی ئەوان خۆ پاکڕاگرەکانن!! ئەو ئایەتە پیرۆزانە ئەوەشمان بۆ دەسەلمێنێت کە شزوزی جنسی پێچەوانەی پاکڕاگرتنە و پێچەوانەی بەها مرۆڤایەتیەکانە!

دوەم: ئەو سزایەی خوای گەورە بەسەر گەلی لوط (علیه السلام) سەپاندی، بوو بە بەزەی و سۆز بۆ مرۆڤایەتی چونکە ئێمە دەزانین کە ئاینی ئیسلام دەست پێشخەربوە لە سەرەتاوە بۆ (الحجر الصحی) جیاکردنەوەی تەندروستی بۆ نەخۆشیە ئاسایەکان، پێغەمبەرﷺ دەربارەی نەخۆشیە گواستراوەکان ئاماژەی بە جیاکردنەوەیان داوە، بەڵام لێرەدا دەبینین جیاکردنەوە بۆ ئەوان جێبەجێ نەکراوە!! ئەویش بەهۆی ئەوکارە چەپەڵەوە (نێربازی) ئەگەر بێت و (الحجر الصحی) لەسەریان جێبەجێ بکرایە ئەوا ئەمانەوە، هەر لە کاری بەدڕەوشتی و نێربازی بەردەوام دەبون و برەویان پێدەدا نەخۆشیەکانیش هەر ئەمانەوە ئەو کاتە هیچ سودێک بۆ ئەم بەربەست و جیاکردنەوە نەدەمایەوە. بۆیە (بەرد بارانکراون چەند جارێک لە دوای یەک بە قوڕ یان کانزایەکی سورەوە بوو) بە جۆرێکی وا کەسیانی لێ نەپەڕاندون وە لاشەکانیشیان کە لەو ناوەدا بووە هەروا نەهێڵراوەتەوە بەڵکو نغرۆی ناخی زەوی کراون بە بەراود لەگەڵ سزای نەتەوەکانی پێشوو کە بە یەک جۆر لە سزا سزادراون! بۆ ئەوەی ئەو نەخۆشیە کوشندەیە کە توشیان هاتوە دزە نەکات بۆ ناوچەکانی چواردەوری، پاشتریش ناوچەکەیان بۆتە دەریایەکی پڕ خوێکراو (دەریای مردوو)، دوای تێڕامان لە هەموو قۆناغەکانی سزاکە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە هیچ جۆرە دزەکردنێکی ڤایرۆس و میکرۆب نییە و نابێت، هەروەها دەریاکە ئەوەندە سوێرە هیچ زیندەوەرێکی تێدا ناژی لەبەربونی خاسیەتی (hyperosmolar) لە ئاوی ئەو دەریایە واتە ئەو ناوچەیەی بۆ کردونەتە تابوتێکی گەورە بۆ ئەوەی هەتا هەتایە پیسی و میکرۆبی ئەوان لە مرۆڤایەتیەوە دوور بێت.

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە پێغەمبەرﷺ سێ جار نەفرینی لێ کردون و فەرمانی کردوە بە کوشتنی نێربازەکان هەروەک دەفەرموێت: (من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به). سنن ابی داوود.

هەندێک وێنەی هەڵبژاردە (کە بەهۆی بەکتریای گۆشت خۆرەوە توشی مرۆڤەکان دەبن):



کۆتایی:

کەواتە قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدە ئەم ڕاستیەمان بۆ باس دەکات و، لەم سەردەمەشدا زانست ئەم ڕاستیانەی زۆر بە ڕونی بۆ دەردەکەوێت.. جا ئەمەش شاهێدیەکی ڕونی ترە لەسەر بونی ئیعجاز کە بە تەنها هەر لە قورئان و سونەتدایە بێ هیچ گومانێک.

---

سەرچاوە:

1-http:// www.quran-m.com
2)http://www.webmd.com/news/20071016/more-us-deaths-from-mrsa-than-aids
3) Methicillin-resistant Staphylococcus aureus, or MRSA bacteria, http://en.wikipedia.org/wiki/MRSA
4)http://www.aljazeera.net/NR/exeres/D97D2D-FE-B3B5-4451-A546-EBDC454B998D.htm
5)http://americansfortruth.com/issues/the-agenda-glbtq-activist-groups/gay-cultur
6)http://news.bbc.co.uk/hi/arabic/sci_tech/news-id_7190000/7190899.stm
7) http://www.cdc.gov/mmwr/preview/mmwrhtml/00001114.htm Gental Warts, Genetal Herpes, Chanchroid, Granuloma Inguinalis, Syphilis, Gonorrhea, AIDS, et
8)http://www.who.int
9)www.kaheel7.com

# نوێترین ڕێگا بۆ خۆشگوزەرانی و ڕزگاربون لە نەخۆشیەکانی سەردەم



و: ڕامان عبدالخالق

## گرنگی بە هاوسێکانت بدە.. تا (بە ویستی خوای گەورە) تەندروستیەکی باش و تەمەنێکی درێژت هەبێت..!

گرنگیدان بە هاوسێ و ڕێزگرتنی و یارمەتیدانی و حەزکردن بە چاکە بۆی.. نوێترین ڕێگایە بۆ ڕزگاربون لە نەخۆشیەکانی سەردەم و خۆشگوزەرانی لە ژیاندا..! چۆن، ئایا ئەمە مەعقولە؟ بەڵێ بۆ نا با ئێستاش بەیەکەوە لە نهێنیەکانی ئەم توێژینەوەیە تێ بگەین...

### لێکۆڵینەوەی زانستی:

لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێدا کە پوختەیەکی لە سایتی CNNی ئەمریکیدا بڵاوکراوەتەوە، تێیدا هاتووە، کە هاوسێی باش و یارمەتیدەر کاریگەری ئەرێنی دەبێت لەسەر تەندروستی هاوسێکەی! ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە (تەندروستی و خانەنشینی) کە لە بڵاوکراوەی (زانستی نەخۆشی و تەندروستی کۆمەڵگە)دا بڵاکراوەتەوە و زیاتر لە 5 هەزار بەتەمەن تیایدا بەشدارە، کە پێشتر کەسیان کێشەی دڵیان نەبووە و، لێکۆڵینەوەکە چوار ساڵی خایاندووە و، بەشداربووەکان ملکەچبوون بۆ ئەو ڕاپرسیەی کە ئەوان چەندە لەگەڵ دەوروبەریان تێکەڵ بونە و، چەندێک هاوسێکانیان ڕۆح سوک و هاوکار و جێی متمانەیان بوون.

لە توێژینەوەکە دا دەرکەوتووە، ئەو بەشداربوانەی هاوسێکانیان ئەو پێوانانەیان هەبووە، ئەمان کەمترین جار توشی (دڵتەنگی و گرژی دڵ) بوون، کە 148 کەس توشی بوون لە ماوەی توێژینەوەکەدا. وە توێژەران دەڵێن ئەو کۆمەڵگایانەی بە یەکەوە پەیوەستن، پتەون و ئەوەش دەبێتە هۆی هاندانی شێوازی دیاریکراو لە هەڵسوکەوت، کە دڵ و خوێنبەرەکان دەپارێزێت لە زیان...

وە ڕاستیە زانستیەکە دەڵێت پێویستە لەسەر هاوسێکان هاوکاری یەکتربن و لە نێوانیاندا پەیوەندیەکی باش ببەستن و یارمەتیی بە یەکتر پێشکەش بکەن، ئەوەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی نەخۆشیەکانی دڵ و کێشەکانی پەستانی خوێن، لە ئەنجامیشدا تەمەنێکی درێژ (بە ویستی خوای گەورە)!

### چۆن پێغەمبەر ﷺ سەیری دراوسێکەی کردوە:

پێغەمبەر ﷺ ڕاسپاردەی کردووە بە گرنگی دان بە هاوسێ و هاوکاریکردنی و مامەڵەکردن لەگەڵی بە باشترین شێواز، چونکە ئەو خۆشبەختی ویستوە بۆ شوێنکەوتوانی و هەموو مرۆڤایەتی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: (عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ رضي اللّٰه عنه أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ. وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ. وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ بخاري الادب من كان يؤمن بالله واليوم الاخر ٥٦٧٣) واتە (هەر کەس باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با چاک بێت لەگەڵ هاوسێکەی، هەرکەس باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت، هەرکەس باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە با چاک بڵێت یان بێدەنگ بێت).

سەیری گەورەیی ئەم فەرمودەیە بکەن، ئەگەر خەڵکی تەنها ئەو فەرمودە پیرۆزە جێبەجێ بکەن، چی ڕوودەدات لە ژیانیاندا؟ هەموو هاوسێکان ڕێزی یەکتربگرن و یارمەتی یەکتربدەن لە پێویستیەکاندا.. بەڵێ لە ئەنجامدا هەموو کێشە و ناخۆشیەکانی نێوان خەڵک کۆتایی پێدێت و، هیچ کەس لە دادگاکان و بەندیخانەکاندا نادۆزیتەوە!

دڵی مرۆڤ لە هەموو ئەندامەکانی تر زیاتر بەهۆی هاوسێی خراپەوە زیانی پێ دەگات، بەڵام کاتێ کە هاوکاری و دڵسۆزی و میهرەبانی لە نێوان هاوسێکان پەیدادەبێت، ئەو کات دڵ زیاتر لە کارەکەیدا چوست و چالاک دەبێت و، وا دەکات سیستەمی بەرگری مرۆڤ زیاتر ڕوبەڕوی نەخۆشیەکان بێتەوە.

لە فەرمودەیەکی تری پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ قَالَ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ بخاري الادب اثم من لامن جاره /٥٦٧٠) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (ناچێتە بەهەشت ئەوەی دراوسێکەی لەشەڕ و خراپەی ئەمین نەبێت).

واتە پێغەمبەر ﷺ سیفەتی باوەڕی لە کەسێک سەندەوە کە ئازاری هاوسێکەی دەدات..

ئێستا وەرن با بزانین لەم ڕۆژگارەی خۆماندا، ڕێژەی ئەو موسڵمانانە چەندن کە ئەم فەرمودەیە جێبەجێ دەکەن؟ لەوانەیە ڕێژەیەکی ترسناک بێت، چونکە تۆ نابینیت هاوسێ هەبێت ڕێزی هاوسێکەی بگرێت و یارمەتی پێشکەش بکات! ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشبێت بۆ ئەویشی پێ خۆشبێت.. کەواتە کوا ڕێژەی موسڵمانی ڕاستەقینە لە سەردەمی خۆماندا؟

سوێند بە خوا ئەگەر خەڵکی تەنها ئەم ئامۆژگاریەی پێغەمبەر جێبەجێ بکەن - گرنگیدان بە هاوسێ - هەموو کێشەکان لەناودەچوون و ئێمە دەبوینە باشترین نەتەوە لە پێشکەوتن و گەشەپێداندا... لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، بۆچی پێغەمبەر ﷺ ڕاسپاردەی کردوین بۆ چاکەکردن لەگەڵ هاوسێدا:

(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا تَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ يَقُولُ مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَيُوَرِّثَنَّهُ) بخاري / الأدب/ ٥٦٦٨ واتە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم دەربارەی چاکە لەگەڵ دراوسێدا، هەتا وام دەزانی دراوسێ میرات لە دراوسێ دەبات).

لە کۆتایدا.. خوێنەری ئازیز داواکارین کە گرنگی بدەیت بە هاوسێکەت و ڕێزی بگریت و یارمەتی بدەیت و خۆشت بوێت... ئەوە یەکێکە لە کارە هەرە گەورەکان کە دەبێتە هۆکارێک بۆ چوونە بەهەشت لە ڕۆژی دوایی و، لە دونیاشدا خۆشگوزەران و تەندروست و تەمەن درێژ دەبیت (بە ویستی خوای گەورە).

سەرچاوە:

http://kaheel7.com/ar/index.php/2012-12-04-18-32-28/1699-2014-08-25-14-57-31

سەرچاوەی نوسەر:

http://arabic.cnn.com/scitech/2014/08/24/good-neighbors-are-good-your-heart#251



# ئیعجازێك لە فەرمودەی «في كل كبد رطبة أجر»

ئا / جەمال موحەممەد ئەمین
jamalmhammad@yahoo.com

پەیامبەری ئیسلام ﷺ دەفەرموێت: (في كل كبِد رطبة أجرٌ)، ئەو فەرمودەیەی پەیامبەر ﷺ لەوەوە هاتوە كە (ئەبوزەر) دەیگێڕێتەوە لە پەیامبەرەوە كە فەرمویەتی: «كاتێك پیاوێك بە ڕێگایەكدا دەڕۆیشت و گەرما زۆری بۆ هێنابوو وە زۆر تینوی بوو، بیرێك دێتە بەردەمی و دادەبەزێت و تێر ئاو دەخواتەوە و، كاتێك دێتە دەرەوە دەبینێت وا سەگێك لە گەرمادا ئەوەندەی تینوە كە خۆڵی تەڕ دەخوات و لە گەرمادا زمانی دەرهێناوە و (ها ها) یەتی، بۆیە پیاوەكە دەڵێت حاڵی ئەو سەگە وەك ئەومیە بە سەر مندا هات لە تینویەتیدا، بۆیە دابەزیەوە ناو بیرەكە و بە لێزانانە گۆرەویەكەی كە ئەوكات لە پێست دروستدەكرا پڕكرد لە ئاو و بە دەمی گرتی و سەركەوتەوە، ئینجا ئاوەكەی دەكردە ناو دەمی سەگەكە تا تێر ئاوی كرد، و ئینجا سوپاسی خوای بۆ كرد و خوا لێی خۆش بوو، پێیان وت ئەی پەیامبەری خوا ئایا بۆ ئێمە پاداشت دەبێت لەسەر گیانداران؟ ئەویش فەرموی: (في كل كبِد رطبة أجرٌ)، واتە لە هەموو گیاندارێكی زیندوو پاداشت هەیە، (كبد رطبة) واتە جگەری شێدار و تەڕ كە مەبەستی گیانداری زیندوە.

هەموو زاناكان لەسەر ئەوە كۆكن كە ئاو ڕەگەزی بنەڕەتیە لە دروستبوونی بوونەوەرە زیندوەكان، و دەچێتە نێو هەموو خانەكانی هەموو ئەندامەكان و هەموو گوشراو و شلەمەنیەكان و خوێن و هتد...، ڕێژەی ئاو لەو ناوەندانە بە 70 تا 85٪ مەزەندە كراوە، بۆیە ئاو زۆر پێویستە بۆ ژیان بە تایبەتی بۆ كۆئەندامی هەرس كە بەبێ ئاو هەرگیز كار ناكات، هەروەها ئەو پاشەڕۆیانەی لە ئەنجامی كرداری هەرسەوە دروست دەبن ناكرێنە دەرەوەی لەش ئەگەر ئاو خواردنەوە نەبێت لە لایەن مرۆڤ و گیاندارانەوە كە پاشەڕۆكان بە شێوەی میز یان عەرەق و یان پیسایی فڕێ دەدرێنە دەرەوەی لەش.

بەڵام ئەگەر بڕی ئاو لە لەشدا لە ئاستی پێویست كەمتر بوو، ئەوە دەبێتە هۆی سەرئێشە و بێتاقەتی و بەدهەرسی و قەبزی، و ئەگەر بڕی كەمبوونی ئاوەكە زۆر بوو لە لەشدا ئەوا سیستمی كاری لەش تێكدەچێت و ئینجا جەستە بەرەو ووشكبوون دەڕوات و خانەكان تەڕی و پڕییان نامێنێت و چرچولۆچی لەسەر پێست دروستدەبێت، بۆ پارێزی لە هاوسەنگی ئاو لە لەشدا، لە خوێندا بڕێكی باش لە پرۆتین هەیە كە بە هیچ جۆرێك ناچێتە ناو خانەكانەوە، و لە گرنگترینی ئەو پرۆتینانەی ناو خوێن كە پارێزی لە هاوسەنگی ئاو لە لەشدا دەكات پرۆتینی (ئەلبۆمین)ە، كە تەنها جگەر دروستیدەكات لە لەشدا.

جگەر لە گەورەترین ئەندامەكانی لەشە و بارستاییەكەی 1.5 كگم، و دەكەوێتە لای ڕاستی بەشی سەرەوەی سكی مرۆڤ، بەشی خوارەوەی قەفەزەی سینگ دەیپارێزێت، جگەر نزیكەی 5 هەزار فرمان لە لەشدا ئەنجامدەدات بە مەبەستی بەردەوام بوونی ژیان، هەوێنە بنەڕەتیەكانی دروستبوونی جەستە بەرهەمدێنێت، و لەش ڕزگار دەكات لەو پاشەڕۆ كیمیاییە ژەهراویانەی لە ئەنجامی سوتاندنەوە دروست دەبێت، و شلەی زەرداو بەرهەمدێنێت و دەینێرێت بۆ دوانزەگرێ لە ڕێگای كەناڵەكانی زراوەوە كە تێیدا بڵاوبونەتەوە، كاری زەرداو یارمەتی هەرسی خۆراك دەدات، هەروەها جگەر ژمارەی زۆر لە پرۆتین و هۆڕمۆن و ئەنزیم بەرهەمدێنێت كە بە هەموویان كار و فرمانەكانی لەش ڕێكدەخەن، هەروەها جگەر ماددەی پێویست بۆ مەیاندنی خوێن و زیندەپاڵی كۆلیسترۆڵ دەردەكات، وە ڕێكخستنی ڕێژەی شەكر لە خوێندا و مامەڵە كردن لەگەڵ زۆربەی زۆری ئەو دەرمانانەی مرۆڤ بەكاریان دێنێت و ڕزگاربوون لە پاشەڕۆ كیمیاییە زیانبەخشەكانی لە كارە گرنگەكانی دیكەی جگەرن.

كاری ئەلبۆمین پارێزیكردنە لە پەستانی ئەسمۆزی، پەستانی ئەسمۆزی osmosis: بریتیە لە جوڵەی رووتی گەردە ئاویەكان بە نێو پەردەیەكی نیوە ڕێگاپێدەر كە دەبێتە هۆی ئەوەی ئاو یان گەردەكانی ئاو لە ناوچەیەكی چڕی زۆرەوە (ماددەی كەمی تواوەی تێدابێت) بڕوات بەرەو ناوچەیەكی چڕی كەم (ماددەی تواوەی زۆری تێدابێت) بە بێ سەرفكردنی وزە، پەردە نیوە ڕێگاپێدەرەكە ڕێگا بە تێپەڕبوونی ئاو (توێنەرەوە دەدات بەڵام ناهێڵێت ماددەی تواوەی solute پێدابڕوات، ئەوەش دەبێتە هۆی بوونی بەردەوامی جیاوازی پەستان لە نێوان ئەو دوو ناوچەیەدا، بەو جۆرە ئەلبۆمین ئەو هاوسەنگیە ڕێكدەخات و ئاو لە نێو ڕێڕەوە خوێنیەكاندا دەهێڵێتەوە نەك لە نێو شانەكاندا قەتیس بمێنێت.

دابەزین یان كەمبوونی ئاستی ئەو پرۆتینە دەبێتە هۆی لە دەستدانی هاوسەنگی ئاو و لەویشەوە چوونی ئاو لە دەرەوەی خانەكانەوە بۆ ناوەویان و قەتیسبوونی ئاو تێیاندا، و لە كۆتاییدا ئەو قەتیسبوونە دەبێتە هۆی مردنی خانەكان، ئەمەش ئاماژە دەبێت بۆ بوونی كەموكورتیەك لە فرمانەكانی جگەر و نەتوانینی بۆ بەرهەمهێنانی پرۆتینی ئەلبۆمین.! لە لایەكی دیكەوە ئاستی پرۆتینی ئەلبۆمین پشتبەستوە بە ڕادەی شێداری و تەڕی و پڕی جەستە، ئەو كەسەی ڕێژەی ئاو لە لەشیدا كەمبێتەوە واتە تووشی وشكی جەستە دەبێت و بەوەش ڕێژەی ئەلبۆمین لە خوێنیدا كەمدەكات، و پاش چارەكردنی ئەو دۆخی

وشکبوونە ڕێژەی ئەلبۆمینی ناو خوێنی جارێکی تر بەرز دەبێتەوە. ئەوەش جەخت لە مەودای هەستیاری ئەو پرۆتینە دەکاتەوە بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی ڕوودەدات لە ئەنجامی وشکبوون یان شێداری و تەڕی و پڕی لەش.

لەفەرمووودەی«کَبِدرطبة...»ی پەیامبەر ﷺ دەستەواژەیەکی ناڕاستەوخۆیە بۆ ژیان، و ئەو جۆرە دەستەواژانەش بەوە دەبێت وتەکە بوترێت و بە دواییدا بەرهەمی بێت، بۆ نمونە لە زمانی عەرەبیدا بە کەسێك دەوترێت (كثيرُالرَّمادِ) واتە زۆر بەخشندە و دەست و دڵ فراوانە ؟(رماد) واتە خۆڵەمێش، ئەوەش لە ئاگرکردنەوەی زۆرەوە دەبێت، واتە ئەو کەسە ئاگر زۆر دەکاتەوە بۆچی؟ چونکە چێشت زۆر لێدەنێت بۆیە خەڵکی زۆریش بەردەوام لە سەر سفرە و خوانی ئەو کەسەن بۆیە لە زمانی عەرەبیدا بەو کەسە دەوتریت کابرایەکی خۆڵەمێشی کە مەبەست لەوە کابرایەکی بەخشندە و نانبدەیە، لە زمانی عەرەبیدا بەو گوزارشانە دەوترێت (كناية). لە فەرمودەکەیشدا (رطوبة) کە بە مانای شێداری و تەڕی و پڕی دێت دراوەتە پاڵ جگەر (كبد) واتە تا جگەر شێدار و تەڕ و پڕ بێت ئەوە مانای بەردەوامی ژیانە و هەرکات ئەو ئەندامە وشك بوو ئەوە نیشانەی نەمان و مردنە، جگەری گیانداری زیندوو شێدارو تەڕو پڕە و گیانداری مردووش جەستەی وشك و جگەریشی وشکبوو دەبێت.

لە فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ : « في كل كبِد رطبة أجرٌ» مانایەکی واتایی نێردراوی تێدایە: لە بەشییەوە کە جگەرێکی تەڕ و پڕ و شێدارە کە مەبەستی گیاندارێکی زیندوە، ئەمە بەشییە (جزء) بەڵام مەبەست لێی گشتە (كل)ن کورتەی فەرمودەکە ئەوەیە : بەڵێ پاداشت دەبێت بۆ شێدار و تەڕوپڕ کردنی هەموو جگەرێك واتە هەموو گیاندارێك تۆ چاکەی لەگەڵدا بکەی خوا پاداشتت لە سەری دەداتەوە، لایەنی ئیعجازی لە فەرمودەکەدا ئەوەیە کە پەیامبەری ئیسلام ﷺ تەڕی و پڕی و شێداری جگەری کردوە بە نیشانەی ژیان و زیندەگی کە بە پێی زانستی پزیشکیش ئەوەیە کە جگەر ئەو هەموو فرمانانە ئەنجامدەدات بۆیە نەخۆشکەوتن و وشکبوونی جگەر مانای مردنە. بەڵێ ئیسلامی مەزن ئا بەو جۆرەیە ئەگەر بە ڕاستی پیادەبکرێت ئەوا داوا دەکات خزمەتی گیاندارانیش بکرێت ئینجا چ جای خزمەتکردنی مرۆڤەکان!!! ئیتر دەبێت چی بەوانە بوترێت کە بە ناوی ئیسلامی پیرۆز و مەزنەوە کۆمەڵکوژی مرۆڤەکان دەکەن و ئاخۆ ئەوە لە کوێی ئیسلامی مەزن و پیرۆزدا جێگای دەبێتەوە؟؟. ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ النجم.

---

سەرچاوەکان:-

http://quran-m.com/
http://en.wikipedia.org/wiki/Liver
http://www.webnat.com/articles/Albumin.asp
http://ejtaal.net/islam/madeenah-arabic/ nu4_6.htm
http://ar.wikipedia.org/wiki/%D8%AA%D9%86 %D8%A7%D8%B6%D8%AD

## زەیتی زەیتون

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ (المؤمنون)

واتا:(درەختێکیشمان بۆ رواندون کە لە کێوی طور لە بیابانی سینا سەوز دەبێت کە زەیت و بۆیەی لێدەردەهێنرێت ئامادەیە بۆ کەسانێك کە دەیخۆن، مەبەست درەختی زەیتونە ...) تەفسیری ئاسان.

لەم ئایەتەدا خوای گەورە مرۆڤەکان منەت بار دەکات و، ئەم شێوازەش لە دەربڕیندا بونی سودی تەندروستی لە زەیتی زەیتون دەسەلمێنێت، وە بونی بۆیەی بەسود لەناوی دا بۆ ئەوانەی کە دەیخۆن؛ وە واتاکەی ئەوە دەگەیەنێت: زەیتون جگە لەوەی کە خودی خۆی خواردنە، زەیت و بۆیەشی لێ دەردەهێنرێت کە هەردوکیان هۆی چارەسەرن بۆ نەخۆشی.. بەپێی کۆمەڵەی ئەمریکیش بۆ بەرەو پێشبردنی زانست؛ زەیتی زەیتون یارمەتی دەدات بۆ رونەدانی جەڵتەی مێشك و دڵ لەلایەن بەتەمەنەکانەوە، وە زەیتون بۆیەیەکی تێدایە کە بەرگری دەکات لە توشبون بە شێرپەنجە چونکە لەو جۆرە مادانەیە کە دژە ئۆکسینە.

www.eajaz.org



# تیڕوانینێکی زانستی بۆ ئایەتی:

## ﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ ﴾




ن: صبحي رمضان فرج سعيد/ زانكۆی منوفیه – میسر
و: ئەندازیار هەندرێن صالح محمد امین


خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ النحل.

له تەفسیری ئیبن کەسیردا هاتووە: دەربارەی فەرمایشتی: ﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَالًا ﴾ «قەتادە» دەڵێت: واتە درەخت. ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا ﴾ مەبەست قەڵایە (حصونا و معاقل)، وەک چۆن (سرابیل) بەرگی بۆ بەدیهێناون کە لە گەرما دەتانپارێزێت، و بریتییە لە پۆشاکێک لە لۆکە و کەتان و خوری، ﴿ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴾ وەک قەڵغانە لە ئاسنی تەنککراو زرێ و جگە لەوانەش ﴿ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ ﴾، واتە: بەوجۆرە شتتان بۆ دەڕەخسێنێت تاوەکو لە کارەکانتاندا پشتیان پێببەستن، و ئەوەش کە پێویستتانە، تاوەکو ببێتە یارمەتیدەرتان بۆ گوێڕایەڵی و پەرستشکردن ﴿ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴾ لە (أضواء البيان) ی (شنقيطی) دا هاتووە: ﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم ﴾، خوای گەورە منەتی خۆی لەسەر بەدیهێنراوەکانی ڕوون کردووەتەوە، کە بەرگ و کەلوپەل و هۆکار (سرابیل)ی بۆ دروستکردون لە گەرما دەیانپارێزێت، بەهەمان شێوە: سەرماش، چونکە ئەو پۆشاکەی پارێزەرە بۆ گەرما بۆ سەرماش هەر پارێزەرە. مەبەست لەو پۆشاک (سرابیل)انەش: کراس و هاوشێوەکانییەتی لە پۆشاکی لۆکە و کەتان و خوری» خوای گەورە ئەم بەخششە گەورەیەی لە جێگای تریشدا باسکردووە، وەک دەفەرموێت: ﴿ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ الاعراف.

«پێشەوا تەبەری» لە ڕاڤەی ئایەتی ﴿ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴾ وتەیەک سەربار دەکات کە دەقەکەی بەمجۆرەیە: (حدثني المثنى. قال:ثنا إسحاق. قال: ثنا عبد الرحمن بن أبي حماد. قال: حدثنا ابن المبارك. عن حنظلة. عن شهر بن حوشب. قال: كان ابن عباس يقول: (لعلكم تسلمون) قال: يعني من الجراح. حدثنا أحمد بن يوسف. قال: حدثنا القاسم بن سلام. قال: حدثنا عباد بن العوام. عن حنظلة السدوسي. عن شهر بن حوشب. عن ابن عباس. أنه قرأها: (لعلكم تسلمون) من الجراحات)، واتە: لە «إبن عباس»ـەوە، خوێندویەتیەوە: ﴿ لَعَلَّكُمْ تَسْلَمُونَ ﴾ لە ئازارەکان...

### مەترسییەکانی بەرکەوتەبوون بە تیشکی خۆر:

سێبەر لە ئەنجامی بەرکەوتنی شەپۆلەکانی ڕوناکی بینراو بۆ سەر تەنێکی تاریک (ڕووناکیگر) دروستدەبێت. ئەگەر سەرچاوەی ئەو ڕوناکییە بینراوە خاڵێک بێت ئەوە سێبەری دروستبوو جێکەوتێکی ئەندازەیی ئەو تەنە تاریکە دەبێت کە بە بەربەستی بەردەم ڕووناکی بینراو ناودەبرێت. خۆ ئەگەر سەرچاوەی ڕوناکییە بینراوەکە فراوانتر بوو ئەوکاتە جێکەوتی ئەندازەیی تەنە ڕوناکیگرەکە کە بەربەستی ڕێڕەوی ڕووناکییەکەیە لە ناوچەیەکی سێبەری دەورەدراو بە ناوچەیەکی نیمچە سێبەر پێکدێت، توندیی تاریکییەکەشی شێوەیەکی پلەبەندیی هەیە لە ناوچەی نیمچە سێبەرەکەوە بۆ ناوچەی سێبەری تەواو. سێبەر مرۆڤ و گیاندارەکان و ڕووەک لە مەترسییەکانی بەرکەوتنی هەریەکە لە تیشکی خۆر و گەرماکەی بۆ چەند کاتژمێرێکی زیاتر لە توانای بەرگەگرتنیان دەپارێزێت، ئەمەش بەهۆی چەند شەپۆلێکی پێکهاتەی تیشکی خۆرەوە کە مەترسیدارترینیان تیشکی سەرووەنەوشەییە (U.V.Rays)، کە مەترسی و کاریگەرییە نەرێنییەکانی بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە سەلمێنراون.

خۆر بە یەکێک لە گرنگترین سەرچاوەکانی تیشکی سەرو وەنەوشەیی دادەنرێت، بەڵام چینی ئۆزۆنی دەوری گۆی زەوی ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەر دەبینێت لە ڕێگرتن لە تیشکی سەرو وەنەوشەیی جۆری (C)، هەروەها ڕێ لە بەشێکی زۆری تیشکی (A) و (B)ش دەگرێت. ئەو پێوانانەی بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە ئەنجامدراون ڕوونیان کردووەتەوە کە بڕی ئۆزۆن لە بەرگەهەوای زەویدا لەساڵی 1978 بە ڕێژەی (5%) کەمی کردووە بە بەراورد بە ڕێژەکەی لەساڵی 1971، و ڕێژەی کەمکردنەکەی گەیشتووەتە (2.5%) لە ماوەکانی نێوان 1979-1985 لە ناوچەی نێوان هێڵەکانی پانی 53 ی باکور و باشور. لە دەرئەنجامی کەمبوونەوەی ئۆزۆن، لەساڵی 1985 کونی ئۆزۆن لەسەر جەمسەری باشور ئاشکرا کرا، کە ڕێژەی کەمبوونەکەی گەیشتبووە (50%)، لە مانگەکانی ئاب و ئەیلولی هەموساڵێکدا لەسەرو کیشوەری جەمسەریی باشور دەردەکەوێت، پاشان لە

مانگەکانی پایزدا فراوان دەبێت و دواتر لە مانگی کانونی یەکەمدا دەپوکێتەوە و دیارنامێنێت. کونێک لە نێو گێژاوی جەمسەریدا دروستدەبێت کە بارستەیەکی گەورەی هەوایی ئارادەیەک جیابووەوەیە لەسەر کیشوەری جەمسەریی باشور لە وەرزەکانی زستان و بەهاری جەمسەریدا. ئەگەرچی کونەکە وەرزانە دەردەکەوێت، بەڵام هەرجارێک لەوەی پێشتری خراپتر دەبێت.




تیشکی سەروووەنەوشەیی شەپۆلێکی کارۆموگناتیسییە کە درێژی شەپۆلی لە ڕووناکی بینراو کورتترە، بەڵام لە تیشکی سینی درێژترە. بە سەرو وەنەوشەیی ناونراوە، چونکە درێژی شەپۆلی ڕەنگی وەنەوشەیی لەنێو ڕەنگەکانی شەبەنگدا کورتترینە و لە 400 نانۆمەترەوە دەستپێدەکات بۆ 10 نانۆمەتر.

بەرکەوتەبوون بە تیشکی سەرو وەنەشەیی هاتوو لە تیشکی خۆرەوە لەڕووی ژینگەییەوە بە هۆکارێکی توشکەری شێرپەنجە بۆ مرۆڤ دادەنرێت. کاریگەریی ژەهرینی سەروووەنەوشەیی بەرهەمهاتوو لە ڕوناکی خۆر یان گلۆپەکانی چارەسەری دەستکرد دوو هۆکاری نیگەرانکارن بۆ تەندروستی مرۆڤ. کاریگەرییە مەترسیدارەکانی تیشک لەسەر پێست هەریەکە لە هەوکردنی سوتانەکان و هەوکردنەکانی پێست و خۆرانگازی و لاوازکردنی کۆئەندامی بەرگری دەگرێتەوە.

تیشکی سەرو وەنەوشەیی درێژ (UVA) و ناوەند (UVB) و کورت (UVC) لە توانایدا هەیە ریشاڵە پرۆتینییەکانی (کۆلاجین) تێکبشکێنێت و لەدەرئەنجامدا پیربوونی پێست خێرابکات. هەروەها تیشکی درێژ (UVA) و ناوەند (UVB) دەتوانن ڤیتامین (A)ی ناو پێست تێکبشکێنن.

لە پێشتردا وەها تەماشای تیشکی درێژ (UVA) دەکرا کە مەترسی کەمتر بێت، بەڵام ئەمڕۆ دەزانرێت کە شێرپەنجەی پێست خێرا دەکات بەهۆی تێکدانێکی ناڕاستەوخۆی ترشە ناوکی (DNA). بەقوڵیی بڵاودەبێتەوە، و نابێتە هۆی سوتان بە خۆر یان سوربوونەوەی پێست و هیچ پشکنینێکی پزیشکیی بۆ نییە، بەڵام دژەخۆر (Sunscreen) دەتوانێت ڕێگە لە ئەمیش و لە (UVB)ش بگرێت. لەبەرئەوەی ناتوانێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ترشی ناوکی تێکبدات وەک تیشکی ناوەند و کورت، بەڵام دەتوانێت ناوەندێکی کیمیایی چالاک بۆ کارلێک دروستبکات، وەک ڕەگەکانی هایدرۆکسیل و ئۆکسجین کە ئەمانیش بەشداری تێشکشاندنی ترشە ناوکی دەکەن.

شەپۆلی ناوەندیی (UVB) هۆکاری شێرپەنجەی پێستە و ریشاڵەکانی (کۆلاجین) تێکدەشکێنێت، بەڵام بە ڕێتمێکی خاوتر لە (UVA)، لەڕێی تێکدانێکی ڕاستەوخۆی ترشە ناوکییەوە. تیشکەکە گەردەکانی ترشی ناوکی ناو خانەکانی پێست دەهەژێنێت، بەهۆی بۆندی هاوبەشی ناباو لەنێوان بنچینەکانی (سیتوزین) و یەکە دووانییەکان (وحدات ثنائية)دا. کاتێک (DNA Polymeras) دێت بۆ زیادکردنی ئەو بەشەی (DNA)، یەکەیەکی دووانەیی (وحدة ثنائية) بە «AA» دەخوێنێتەوە نەک بە خوێندنەوە بنچینەییەکەی کە «CC» یە، ئەمیش دەبێتە هۆکاری دووبارە پێکهێنانەوەی بۆندەکانی بنکەی دراوە (قاعدة البيانات)ی (سایمن) بۆ (دووانە سایمدین)، کە ئەمەش شێوەی لولپێچی (DNA) دەشێوێنێت و کۆپیکردن ڕادەگرێت و بۆشایی یاخود کەلێن دەردەکەوێت و ڕێگە لە یەکگرتن (إندماج) دەگیرێت. ڕەنگە بازدانی بۆماوەیی ڕووبدات کە دەبێتەهۆی گەشەی شێرپەنجەیی، ئەو بازدانە بۆماوەییەی کە بەهۆی تیشکی سەرو وەنەوشەییەوە ڕوودەدات، دەکرێت بەئاسانی بەهۆی چاندنی بەکتریاوە تێبینی بکرێت. ئەم بۆندە شێرپەنجەییە لەو هۆکارانەی دادەنرێت کە هانی گرنگیدان بە دەرکەوتنی کونی ئۆزۆن دەدات. لەشی مرۆڤ وەک بەرگریکردن لە تیشکی سەرو وەنەوشەیی ئەسمەر دەبێت لەکاتی بەرکەوتەبوونی بە ئاستێکی شیاو لە تیشکی (UVA) (بەپێی جۆری پێستەکە) بۆیە قاوەییەکە تاریک دەبێت و (UVB)ش بەرهەمێکی نوێ دەدات. ئەو ئەسمەر هەڵگەڕانە بڵاوبوونەوەی سەرو وەنەوشەیی ڕادەگرێت و ڕێ لە تێکچوونی بەهێزی شانە لاوازەکانی جەستە دەگرێت.

لە بەرامبەردا پێستی مرۆڤ بە هێڵی یەکەمی بەرگری دادەنرێت لە دژی میکرۆبەکان و چینی چەوریی پێستیش وەک نەگەیەنەرێکی گەرمی کاردەکات. ئارەقە ڕژێنەکانیش پارێزگاریی لە هێشتنەوەی پلەی گەرمی لەش دەکەن، لەڕێی دەردانی ئارەقەوە ناهێڵن بەرزببێتەوە، هەروەها وەرگریی دەمارییان تێدایە بۆ هەستکردن بە گەرما و سەرما و پەستان و بەرکەوتن، ئەمە سەرەڕای دەردانی (میلانین) لە پێستدا کە لە تیشکی سەروووەنەوشەیی دەیپارێزێت و ئەگەری توشبوون بە شێرپەنجەی پێست کەمدەکاتەوە.

کۆی گشتی حاڵەتەکانی توشبوون بە شێرپەنجەی پێست لەسەر ئاستی جیهان ساڵانە دەگاتە (105 هەزار) حاڵەت. ڕێژەی جۆرییەکەشی دەگاتە (0.9) نێر بۆ هەر مێیەک. ژمارەی حاڵەتەکانی مردن بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە دەگاتە (33 هەزار) حاڵەت لە ساڵێکدا، بەڕێژەی جۆریی (1.1) نێر/ مێ.

لەڕووی توشبوون بە شێرپەنجەی پێستەوە ئوسترالیا لەپێشەوەی وڵاتانی دونیا دێت. لە هەر سێ کەس پێش مردنیان دووانیان توشی شێرپەنجەی پێست دەبن. نەخۆشییەکە ڕێژەی (80%)ی کۆی دیاریکردن (تشخيصات)ەکانی نەخۆشییە شێرپەنجەییە نوێیەکان پێکدێنێت. ژمارەی مردن لە نێوان توشبووان بە شێرپەنجەی پێست (جگە لە میلانۆما) دەگاتە 420 حاڵەت لەساڵێکدا، بۆ توشبوونەکان بە شێرپەنجەی (میلانۆما)ش ئەم ڕێژەیە بۆ 1430 حاڵەت لە ساڵێکدا بەرزدەبێتەوە. توشبوونەکان لە نێوان ئەو کەسانەی تەمەنیان لەنێوان (15-44) ساڵیدایە بە شێوەیەکی بەرچاو زیاددەکات، ئەوەش بۆ بەرزیی کاتژمێرەکانی درەوشانەوەی خۆر دەگەڕێتەوە، کە ژمارەی ڕۆژە خۆرەتاوییەکان لە ئوسترالیا دەگاتە 300 ڕۆژ/ ساڵ.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ژمارەی دیاریکردنەکانی توشبووان بە (میلانۆما) دەگاتە 58.094 حاڵەت لە ساڵێکدا لەوانە 33.041 حاڵەتی لەنێوان نێرەکان و 25.053 حاڵەتی لە نێوان مێیەکاندایە، لەکاتێکدا ژمارەی مردووان دەگاتە 8.461 حاڵەت، لەنێو نێرەکاندا بۆ 5.506 حاڵەت بەرزدەبێتەوە و لە نێو مێیەکانیشدا دەگاتە 2.955 حاڵەت/ساڵ.

شێرپەنجەی خانە بنکەییەکان (Basal Cell Carcinoma – سرطان الخلايا القاعدية) بە بەربڵاوترین شێوەی شێرپەنجەکانی پێست دادەنرێت. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ساڵانە 2.8 ملیۆن حاڵەتی ئەم

نەخۆشیە دیاریدەکرێت. ئەگەر چی کەم کوشندە دەبێت، بەڵام دەبێتە هۆی شێواندنی زۆر ئەگەر ڕێ بە پەرەسەندنی بدرێت. بەڵام شێرپەنجەی خانە پولەکەییەکان (Squamous Cell Carcinoma - سرطان الخلايا الحرشفية) دووەمین بەربڵاوترین شێرپەنجەی پێستە، کە لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکادا ساڵانە 700.000 حاڵەتی لێ دیاری دەکرێت. میلانۆما Melanoma بە سێیەم جۆر دادەنرێت وە یەکێکە لە ترسناکترین جۆری شێرپەنجەی پێست، بەهۆی تێکشکاندنیDNA خانەکان بە هۆی UV ی تیشکی خۆر، ئەم جۆرەیان زوو گەشە دەکات و بڵاودەبێتەوە، زیاتر لە شێوەی خاڵێک دەبێت کە شێوە و ڕەنگی ئەگۆڕدرێت، ئەگەر زوو بدۆزرێتەوە ئە توانرێت بەری پێبگیرێت، بەڵام زۆربەی ئەو حاڵەتە گەشە دەکات بە بێ ئەوەی پێی بزانرێت سەرئەنجام دەبێتە هۆی مردنی مرۆڤەکە.

ڕێژەی بەرکەوتنی هاوڵاتی ئەمریکی بە تیشکی سەرو وەنەوشەیی لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی تر دەگۆڕێت، تاکو تەمەنی چل ساڵی ڕێژەی (%46.5) وەردەگرێت و ئەم ڕێژەیە بەرزدەبێتەوە بۆ (%73.7) لە تەمەنی شەست ساڵیدا، تا دەگاتە لە (%100) لەکۆتایی تەمەنیدا (گەر وادابنێین درێژترین تەمەن 78 ساڵە).

## کاریگەریی خۆدانەپۆشین:

کۆمەڵەی ئەڵمانی بۆ پزیشکانی نەشتەرگەری دەم و شەویلگە و ڕووخسار ئاماژەی بەوەدا کە لەم ساڵانەی دوایدا ڕێژەی توشبوون بە جۆرەکانی شێرپەنجەی پێست (لە ناوچەی ڕووخساردا) بە ڕادەیەکی زۆر بەرزبووەتەوە. پرۆفیسۆر «فولکەر شفیبر» ئاماژەی بەوەدا کە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا و لە ئەڵمانیادا لە هەر (100هەزار) کەس شەشیان توشی شێرپەنجەی ڕەش (السرطان القتامی - السرطان الأسود) دەبوون کە توشی ڕووخسار دەبێت. ئەوەشی سەریار کرد کە ڕێژەی توشبووان بەم نەخۆشییە ترسناکە لەکاتی ئێستادا گەیشتۆتە دوو هێند.




وێنەی ڕوونکراوەی بەرکەوتنی تیشکی سەرو وەنەوشەی بە ناوکە ترشی DNA

پرۆفیسۆرە ئەڵمانییەکە بەرزبوونەوەی ڕێژەی توشبوونەکان بە شێرپەنجەی ڕەشی بۆ زیادبوونی ژمارەی ئەو کەسانە گەڕاندەوە کە گەرماوی هەتاویی (حمام شمسي) دەکەن بە بێ خۆپارێزییەکی گونجاو و پێویست.

هەروەها «شفیبر» کە سەرۆکی نەخۆشخانەی زانکۆیی شاری (مونستەر)ـە، هێمای بە بەرزبوونەوەی ڕێژەی توشبوونەکان کرد بەشێوەیەکی تایبەت لەنێوان نەوەی ئەو خانمانەی تەمەنیان پەنجا بۆ حەفتا ساڵە (چونکە ئەمانە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا پشووەکانی خۆیانیان لە کەنار دەریاکانی ئیتاڵیادا بەسەر دەبرد).

لەوانەیە لە بابەتە دژ یەکەکانی شارستانییەتی ئەمڕۆ بێت کە خۆدانەپۆشین و دەرخستنی جەستە بووەتە یەکێک لە گرنگترین ڕواڵەتەکانی، لەکاتێکدا ڕاستییەکە بە پێچەوانەوەیە، چونکە ئەگەر شارستانی بە ڕوتبوونەوە و دەرخستنی جەستە بووایە گیاندارەکان پێش ئێمە پێی دەگەیشتن.

ئەگەر کارەکە بەوجۆرە بووایە خوای گەورە داپۆشینی عەورەتەکانی نەدەکرد بە یەکێک لە بەخششەکانی بەهەشت، و نەیدەکرد بە سزای ئەو کەسەی سەرپێچی و بێفەرمانی دەکات، خوای پاک و بێنیاز دەفەرموێت: ﴿ فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَى ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَى ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى ﴿١٢١﴾ ﴾ طه.

لە ڕاڤەی ئەم فەرمایشتەی پەروەردگاردا کە دەفەرموێت: ﴿ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ يَنْزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأعراف. «ئیبن کەسیر» (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: «خوای گەورە منەت بەسەر بەندەکانیدا دەکات کە بەرگ و پەڕی بۆ فەراهەم کردون. ئەم پۆشاکەی لێرەدا باسکراوە بۆ داپۆشینی عەورەتەکان بریتییە لە (سووات)، و پەڕیش: بریتییە لەوەی کە ڕواڵەتی پێ جوان دەکرێت. ئەوەی یەکەم لە پێویستییەکانە و پەڕیش لە تەواوکارییەکان و زیادەکانە».

پێدەچێت خۆداپۆشین و باڵاپۆشی (الحشمە و التستر) کە تاوەکو ئێستاش وەک «ئاین و کلتور» لە نێوان زۆرینەی کۆمەڵگاکانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی بڵاودەبێتەوە، لە گرنگترین هۆکارەکانی کەمیی ڕێژەکانی توشبوون و حاڵەتەکانی مردنی دەرئەنجامی ئەمجۆرە نەخۆشیانە بێت لەم کۆمەڵگایانەدا.

## قەدەغەکردنی دانیشتن لەنێوان سێبەر و هەتاودا:

لە «أبي هريرە»ەوە (ڕەزای خوای لێبێت) وتویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إذا كان أحدكم في الشمس فقلص عنه الظل، فصار بعضه في الشمس وبعضه في الظل فليقم» ئەم فەرموودەیە «ابو داود» گێڕاویەتییەوە و لاوازییەکی تێدایە، بەڵام شاهیدێکی هەیە بە سەنەدێکی ڕاست لە (أبي عياض)ـەوە، لە یەکێک لە سەحابیەکانەوە کە وتویەتی: «أن رسول الله نهى أن يجلس الرجل بين الضح والظل وقال مجلس الشيطان» (صححه الحاكم ووافقه الذهبي ...... والضح هو ضوء الشمس). بەهەمان شێوە «بريدة بن الحصيب» گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ «نهى أن يقعد الرجل بين الظل والشمس». کاری جەستە ڕێکنایەت هەتاوەکو لەسەرجەم ئەندامەکانیدا لەسەر هەمان ڕیتم ڕێ نەکات، ئەگەر ئەوە هاتەپێش سوڕان دەشێوێت و فرمانی ئەندامەکان تێکدەچێت، هەر ئەمەش ڕوودەدات لەکاتی دانیشتن یان خەوتن لەنێوان سێبەر و هەتاودا.

## خۆرگیران و فەرماندان بە مانەوە لە مزگەوت و نزاکردن لەوکاتەدا:

لە دۆخە سروشتییەکاندا لەنێوان کاتژمێر (دە)ی بەیانی تا (دوو)ی دوانیوەڕۆ تیشکی سەرو وەنەوشەیی زیاددەکات. لەکاتی خۆرگیراندا سەرنجمان ڕادەکێشرێت بۆ چاودێریکردنی وەک دیاردەیەکی گەردوونی، و ئەوەی هاندەری زیاتری چاودێریکردنی خۆرە دابەزینی توندی ڕۆشناییەکەیەتی لە میانەی گیرانەکەیدا (ئەو ساتەی مانگ بەربەستی بەردەم بەشێک لە ڕووناکی خۆر دەبێت). بەمەش درەوشانەوەی گەرمی دەرچوو لە خۆرەوە کەم دەکات کە ڕێگا لە خەڵکی دەگرێت

خۆر ببینن. لەو کەشە تاریکەی هاوڕێی خۆر گیرانەکەیە بیلبیلەی چاویش بە پلەیەکی زیاتر دەکرێتەوە، و ڕێژەیەکی زۆر لە تیشکە زیانبەخشەکان دەچنە ژورەوە و دەگەنە ناوەندی بینین لە تۆڕەی چاودا، بەمەش گۆڕانی کیمیایی و گەرمیی ڕوودەدات و زیان بە وەرگرە ڕووناکییەکان دەگات کە بە پلەیەکی هێندەبەرز کاردەکاتە سەر توانای بینین هەندێکجار دەگاتە ڕادەی نابینابوون. ئەم دەرکەوتەیە هەر لەکۆنەوە بە «نابینابوونی خۆرگیران» ناسراوە.

لەکاتێکدا لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەرە ﷺ کە لەم دۆخەدا نوێژ و نزا بکرێت. «پێشەوا بوخاری» لە «المغیره بن شعبه» گێڕاویەتییەوە، وتویەتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و لە ڕۆژی مردنی «ئیبراهیم»دا خۆر گیرا، خەڵکی وتیان: بۆ مردنی «ئیبراهیم» خۆر گیراوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (إن الشمس والقمر لا ینکسفان لموت أحد ولا لحیاته، فإذا رأیتم فصلوا وادعوا الله).

لە گێڕانەوەیەکی تردا و لە « عائیشە»ی دایکی ئیمانداارانەوە (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللَّهَ وَكَبِّرُوا وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا).

پێدەچێت یەکێک لە هەڵوێستە سەرنجڕاکێشەکان پەلەکردنی پێغەمبەر ﷺ بێت لە چوونی بۆ مزگەوت و نوێژکردنی بە خەڵکی، و بەردەوامبوونی لە نوێژ تا کۆتایی خۆرگیران و دەرکەوتنەوەی خۆر. دوای ئەوەش وەسیەت کردنی بۆ موسوڵمانان بە نوێژکردن و نزاکردن بەدرێژایی کاتی خۆرگیرانەکە. لەلایەکی ترەوە، پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا نوێژی بە موسوڵمانان کرد، جیاواز لە نوێژی بارانبارین و جەژنەکان کە لە چۆڵیدا (دەرەوەی مزگەوت) کردوونی، پێدەچێت یەکێک لەهۆکارەکانی ئەم کارە تیشکە زیانبەخشەکان بێت کە دەشێت تەماشاکردنی پەپکەی خۆر هۆکاری بن. ئەوەشمان بیرناچێت کە سوننەتە لە نوێژدا تەماشای شوێنی سوژدە بکرێت نەک ئاسمان.

پەروەردگار ڕاستی فەرمووە: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل.

---

سەرچاوە:
http://quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=1167
هەندێک لە سەرچاوەکانی نوسەر:
(1) http://medical.sitamol.net
(2) http://maps.grida.no/library/files/storage/04-extra-cancer-maps_p.png
(3) http://www.cdc.gov.
(4) http://www.skincancer.org.
(5) http://jameskilgourblog.com/
(6) www.drmelton.com
(7) http://www.skincancerguide.ca.
(8) http://www.saaid.net/Minute/146.htm

## تەمەن و باوەڕبوون بە خودا

### لەگەڵ بەرەوسەرچوونی تەمەنی مرۆڤ باوەڕبوون بە خودا زیاد دەکات تەنانەت لە دەوڵەتە بێ دینەکانیشدا

بەگوێرەی ئەم لێکۆڵینە و ئامارانەی دەستکەوتووە دەربارەی وڵاتە جیاوازەکان دەرکەوتووە کە تەنانەت لە دەوڵەتە بێدینەکانیش بە هەمان شێوە لەگەڵ بەرەوسەرچوونی تەمەنی مرۆڤەکان باوەڕبوونیان بە بوونی خودا زیاد دەکات.



تێبینی/ مرۆڤەکان کاتێک لە تەمەنی گەنج و هەرزەکاریدان وەک باوە کەمتر بەلای ئاییندا دەچن لە چاو تەمەنی پیری ئەویش بەهۆی ئەوەیە کە لەم تەمەنە کەمانەدا مرۆڤ خەیاڵ و توانای بەرەو دونیا و شتە دونیاییەکان سەرف دەکات، کاتی خۆی بە دونیاوە سەرقاڵ دەکات بەمەش غافڵ دەبێت لە دونیای واقع و بیرکردنەوە، بەڵام کاتێک هێز لەدەست دەدات ئەوکات بەرەو بیرکردنەوە دەچێت و هەست دەکات دونیا فریویداوە، ئنجا ئەو کات بەرەو فیترەتی ڕاستەقینەی خۆی هەنگاو دەنێت.

## UChicagoNews

### Belief in God rises with age, even in atheist nations

By William Harms
APRIL 18, 2012

International surveys about the depth of people's belief in God reveal vast differences among nations, ranging from 94 percent of people in the Philippines who said they always believed in God, compared to only 13 percent of people in the former East Germany. Yet the surveys found one constant—belief in God is higher among older people, regardless of where they live.

A new report on the international surveys, "Belief About God Across Time and Countries," was issued by the General Social Survey of the social science research organization NORC at the University of Chicago. It is based on a comprehensive, international study of belief in God and includes information from the International Social Survey Program, a consortium of the world's leading opinion survey organizations. Tom W. Smith, director of the General Social Survey, wrote the report.

The data came from 30 countries in which surveys about belief in God have been taken, in some cases, since 1991. Researchers asked questions to determine people's range of beliefs, from atheism to strong belief in God; their changing beliefs over their lifetime; and their attitude toward the notion that God is concerned with individuals.

BELIEF IN GOD VARIES WIDELY ACROSS NATIONS, CULTURES

Countries with the strongest belief in God tended to be Catholic societies, especially in the developing world, such as the Philippines.

---

سەرچاوە: گۆڤاری هەواڵی زانکۆی شیکاگۆ http://goo.gl/e98OQA

# دۆزینەوەی دەریایەك لەژێرچینی سێهەمی زەوی دا

و: تارا علی




وێنەی ڕونکراوەیی چینەکانی زەوی

پێغەمبەری ئازیز ﷺ چواردە سەدە لەمەوبەر هەواڵی بونی ئاگری پێداوین لەژێر دەریادا، و هەروەها بونی دەریاش لەژێرئاگردا، ئاخۆ کێ ئەم دۆزینەوە نوێیەی پێ ڕاگەیاند؟

گۆڤاری (دەیلی مەیل)، یەکێک لە دۆزینەوە سەیر و سەمەرەکانی بڵاوکردەوە کە بەم شێوەیە ئاماژەی پێداوە:

لە قوڵایی 600–400 کیلۆمەتر لە ژێر ڕوی زەوی دا، دەریایەکی مەزن دۆزراوەتەوە! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شوێنی دەریاکە کەوتۆتە ژێرچینی سێهەمی چینەکانی زەوی یەوە. بڕی ئەو ئاوەی لەم دەریایەدا بەدی کراوە بە سێ هێندەی بڕی ئاوی سەر زەوی مەزەندە کراوە، زاناکان ئەم دۆزینەوەیان لە مانگی ئازار و مارسی 2014 دا خستە ڕوو بۆ جیهان..

دەرەنجام زەوی دوو دەریای گرتۆتە خۆ، یەکێکیان بەسەر ڕوەکەیەوە دیار و بەرچاوە هەروەک پێی ئاشناین، ئەوی دیش لە قوڵایی دایە و لە ژێر چینی سێهەمی ڕوی زەوی دا شاردراوەتەوە، هەر لە ژێر دەریای سەرڕوی زەوی دا، چینێکی تەنک هەیە و پاشان چینی دوهەم دێت و دواتر لە چینی سێهەمدا کە چینێکی ئاگرینە، گرکانەکان و شلە ئاگرینە تواوەکانی لێوە دەر دەچێت و هەڵ دەقوڵێت، لە ژێر ئەم چینەی دوایشدا دەریایەک هەیە کە تازە زاناکان دۆزیویانەتەوە.

# پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

# فَإِنَّ تَحْتَ الْبَحْرِ نَارًا وَتَحْتَ النَّارِ بَحْرًا

بەم پێیە چینەکانی زەوی دەبنە حەوت چین: ١- توێکڵی زەوی.٢- بەرگی بەردین. ٣- شریتی سەرو. ٤- شریتی ناوەڕاست کە ئەو دەریایەی تێدایە کە تازە دۆزراوەتەوە کە چینێکی گوازراوەیە. ٥- شریتی خواروو. ٦- ناوکی دەرەکیی. ٧- ناوکی ناوەکیی، دەرەنجام دیمەنەکە ڕونبوەتەوە و ژمارەی چینەکانی زەوی بونەتە حەوت چین.

ئەم ڕاستیەش خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێداوە: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾ ﴾ الطلاق.

کەواتە ڕاستیە زانستیە دڵنیاکەرەوەکە دەڵێت: لە ژێردەریاکاندا ئاگر و شلەی ئاگرینی تواوە هەیە کە لە چینی دوهەمی زەویەوە هەڵدەقوڵێت و لەژێر ئەم چینە گڕگرتوەشدا دەریایەکی زۆر مەزن هەیە، لە کۆتایی دا ئەم ڕیزبەندیەمان بۆ دروست دەبێت : دەریا — ئاگر — دەریا.

ئەی پێغەمبەری مەزن و خۆشەویستەمان، چی دەڵێت؟ چۆن باسی ئەو بابەتەی کردوە کە زاناکان لەسەدەی بیست و یەکدا دۆزیویانەتەوە؟!

پیغەمبەری ئازیز ﷺ فەرمویەتی:

(فإن تحت البحر ناراً وتحت النار بحراً) ئەبو داود گێڕاویەتیەوە

ئەم فەرمودە پیرۆزە باس لە و ئاگرە دەکات کە لە ژێر دەریادا هەیە و زاناکان چەندساڵێک لەمەو بەر ئەم ڕاستیەیان سەلماند، وە ئەمڕۆش بونی ئاویان لە ژێر ئەو ئاگرەدا سەلماند! پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا ئەم دۆزینەوەیە گەواهیدان نیە لەسەر ڕاستگۆیی (محمد)ی خۆشەویستمان ﷺ؟




با سەیرێکی ئەم دیمەنە بکەین پاشان لە فەرمودە پیرۆزەکە ورد بینەوە:



گۆی زەوی لە ڕوی دەرەوەی دا لە تۆپێکی شینی جوان دەچێت، بەڵام لەناخی دا چەندەها چینی ئاگرین و شلەی ئاگرینی شاردۆتەوە. لەکاتێکدا ڕوکاری دەرەوەی گۆی زەوی دەریا و هەور و هێمنی باڵی بەسەردا کێشاوە، چینی ژێر توێکڵی تەنکی زەوی چەند چینێکی گرسەندو بەدی دەکرێت، لەگەڵ ئەم چینە ئاگرینانەشدا دەریایەکی مەزنتر و گەورەتر هەیە.

---

سەرچاوە:

http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-20-13-13/1681-2014-06-21-15-58-17

سەرچاوەی نوسەر :

http://www.dailymail.co.uk/sciencetech/article-2579584/The-vast-reservoir-hidden-Earths-crust-holds-water-ALL-oceans.html

# لێکچواندی زیندووبوونەوەی مرۆڤ، بە چەکەرەکردنی ڕووەکەو

و: دەریا کاوە

دوای ئەوەی کە بێباوەڕان نکوڵییان کرد و هەوڵی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر ﷺ داو ئەوەش کە هێناویەتی.

بەڵام خوای گەورە هەموو شتێکی ڕوونکردۆتەوە، ئایەت و بەڵگە گەردوونییەکانی پێشوو دەبنە نیشانە و بەڵگە لەسەر حەقیقەتی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی. ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو شیکردنەوە زانستییانەدا دەژین کە ڕاستییەکان دەسەلمێنن و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە دەردەخەن.

(د. وهبە الزحیلی) لە تەفسیری (المنیردا) دەڵێت: خوای گەورە نیشانە و دەسەڵاتی خۆی دەرخستووە لەسەر ڕاستێتی سەرەتا و کۆتایی، واتە مانەوەی هەتا هەتایی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ ۖ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ ﴿١١﴾ ﴾ق

واتە: (ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی کە بەسەریانەوەیە چۆنمان درووستکردووە و ڕازاندوومانەتەوە و لە هەموو جۆرە ڕووەکێکی جوان و ڕازاوەمان تیایدا ڕواندووە). لە دوای ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزە، دەچینە سەر لێکدانەوەی ئەم ئایەتەی تر کە خوای گەورە دەفەرموێت: (لە ئاسمانەوە ئاوێکی بە پیت و بەرەکەتمان هەردەم دابەزاندووە، جا بەهۆی ئەوەوە چەندەها باخ و دانەوێڵەی ئەو کشتوکاڵانەی کە دروێنەکراون دەڕوێنین).

سەیری توانا و دەسەڵاتمان بکەن کە چۆن لە هەورەوە باران دەبارێنین، بارانێکی زۆر بە پیت و بەرەکەت، کە دەبێتە هۆی گەشەکردنی باخەکان و زۆربوونی سەوزایی و داری بە پیت و بەرەکەت، ڕواندنی ئەو تۆوانەی کە چێنراون وەکو گەنم و جۆ و گەنمەشامی و ... هتد.

(هەروەها دار خورمای قەشەنگ و بڵند سەری هەڵدا کە هێشووە خورمای جوان و لەسەر یەک و ڕیزکراو دەگرێت).

چەکەرەمان بە خورمای بەرز و دەرکەوتوو کردووە، ئەوەی کە لێوەی دەردەچێت ( یەکەم شت کە لە بەری دارخورماوە دەردەچێت)، ڕێکخراوە و کۆکراوەتەوە لەسەر یەکتری، مەبەست لە زۆر دەرکەوتە و کۆکراوەیی نیشانەیە بۆ زۆری بەرەکەی و سوودەکەی، دووبارەکردنەوەی ئەم نیشانەیە دوای ئەوەی کە لە ئایەتی پێشوودا باسکرابوو، ئەوەی کە خوای گەورە فەرمویەتی: (فانبتنا بە) نیشانەیەکی جەختلێکراوە بۆ ڕووەکەکە خۆی، یان بە دارەکان کە گەشە دەکەن و زیاد دەکەن، هەروەها هەر بەو جۆرەش جەستەی مرۆڤ دوای مردن ئەژێتەوە و گەشە دەکات و زیاد دەکات بەهۆی گەڕانەوەی هێزی ژیان و گەشەکردن بۆی، وەک چۆن ئەم هێزە دەگەڕێتەوە بۆ ڕووەکەکان بەهۆی ئاوی باران لە ئاسمانەوە، (ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە ڕزق و ڕۆزی بۆ بەندەکان هەر بەو ئاو و بارانە شوێنە مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، هەر ئاوەهاش لەدوای مردن ئێوە لە خاک دێنە دەرەوە).

چەکەرەکردنی هەموو ئەوانەی کە هەیە لە ڕزق و ڕۆزی ڕووەک و هەموو دارەکان دەبێتە ڕزق و ڕۆزی بۆ بەندەکان، بەهۆی ئاوەوە شوێنی وشک و بێ بەرهەممان ژیاندوەتەوە کە پێشتر هیچ بەرهەمێکی نەبووە و هیچی تێدا نەڕواوە، دەرهێنانی مردووەکانیش لە گۆڕەکانیان لە ڕۆژی زیندووبونەوەدا، هەر بەو جۆرەیە کە خودا زەوی مردوو ئەژێنێتەوە. کە ئەمە نیشانەی بە توانایی و دەسەڵاتی خوای گەورەیە...





# کەوە بە هۆی بارانبارینەوە

ئەمە لێکچواندنێکی نزیکە بۆ تێگەیشتن لە زیندووبونەوەی ڕۆژی دوایی، وە لە ڕاستیدا ژیان هەستپێکراوێکی هاوسنوورە لەگەڵ مرۆڤ. جا چۆنێتی چەکەرەکردن و گەورە بوون و باڵابوونی ڕووەک، واتا و دەرخەری توانا و قودرەتی خوای گەورەیە!!

## لێکدانەوەی زانستی بۆ ئایەتەکان:

ئێستا با لەگەڵ ڕاڤەی زانستیی ئایەتەکاندا بژین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ ﴿٩﴾﴾ ق. لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە بۆمان ڕووندەکاتەوە کە ئاوی بە پیت لە ئاسمانەوە دەبارێت، دەبێتە هۆی چەکەرەپێکردنی ڕووەک لە جیناتی فرە ڕەگەز (توخم) و جۆر و شێوەی جیاواز، چەکەرەکردنی ڕووەکە دانەوێڵەییەکانی وەکو گەنم و جۆ و گەنمەشامی، ئایەتەکە ئاو پەیوەست دەکات بە چەکەرەکردنەوە. هەروەکو دەزانین کە ئاو مەرجێکی بنچینەییە بۆ چەکەرەکردن، کە ئەگەر ئاو نەبێت هیچ ڕووەکێکی سەر زەوی گەشە ناکات، تۆ و دانەوێڵە لە خاکدا بە بێ ئاو چەکەرە ناکات، بەڵام کە ئاومان کرد بەسەریدا و ئاویان خواردەوە، بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەستدەکەن بە چەکەرەکردن.. ڕاستەوخۆ ڕۆیشتنی ئاو بۆ ناو پێکهاتەکانی ناوەوە لە تۆ و، یان دانەوێڵە، یەکسەر دەستدەکات بە کردارە زیندەکیمیاوییەکان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، پاشان ئەنزیماتی کۆرپەلەیی دەردەدرێت کە ئەم دەردراوە ماددەی خۆراکی دەگۆڕێت بۆ (کاربۆ هێدرات و چەوری و پرۆتین)، واتە لە ماددەی نازیندووی پێکهاتە ئاڵۆز کە ناتوانێ بەناو پەردەی خانەدا تێپەڕێت و کۆرپەلە ناتوانێت بیمژێت، بۆ ماددەی نازیندووی پێکهاتە سادە کە کۆرپەلە توانای مژینی هەیە و بە پەردەی خانەدا تێدەپەڕێت. وە ڕاستەوخۆ دوای ڕۆشتنە ژوورەوە کۆرپەلە ژیانی تێدا دروست دەبێت، بە فەزڵی خوای گەورە، پاشان کۆرپەلە دەستدەکات بە گەشەو ئەندامەکانی دەردەکەوێت کە ڕەگ و ڕیشەیە، ئاڕاستەی ڕەگ ئاسایی بۆ ناو زەوییە، بە ئاڕاستەی هێزی کێشکردنی زەوی وە ڕیشە بەرز دەبێتەوە بۆ سەر زەوی بە پێچەوانەی هێزی کێشکردنی زەوی، فەلەقەکان دەردەکەوێت (لەگەشەی هوائی دا) پاشان زیاتر گەشەدەکات و گەڵای سەوز دروست دەکات، دەستدەکات بە کرداری ڕۆشنە پێکهاتن و بە جێگیرکردنی گەڵاکان بە پلاستیدە سەوزەکان. وە $CO_2$ ی هەواو $H_2O$ چالاک دەبێت دوانە ئۆکسیدی کاربۆن لەگەڵ هایدرۆجینی ئاوەکەدا یەکدەگرێت و بەوەرگرتنی وزەی ڕوناکی ماددەی کاربۆهێدراتی یەکەمی دروستدەکات!!

هەر بەو جۆرەش خوای گەورە مردووەکان لە گۆڕەکانیان دەردەهێنێت. کاتێک باران دەبارێ بەسەر مردووەکاندا لە ڕۆژی دواییدا بەشە شیبووەوەکانیان دەستدەکات بە کۆبوونەوە و ژیانیان بۆ دەگەڕێتەوە و مرۆڤ دووبارە دروست دەبێتەوە، بە قودرەتی خوای گەورە وەک چۆن ڕووەک دروستدەبێت لە کرداری چەکەرەکردندا، چۆن ماددە خۆراکییەکان لەناو ڕووەکدا دەگۆڕێ بۆ زیندە ئەندام، کە دواتر گەشەدەکات و هەناسە دەدات و دەخوات و گۆپکە و گەڵا دروستدەکات و گوڵ و بەر دەگرێت و هەڵدەسێ بە کردارەکانی دروستبوون و لە ناو چوون کە هیچ کام لەمانە بوونیان نەبوو لە تۆوێکدا، یان لە دانەوێڵەیەکدا پێش چەکەرەکردن.

هەر ئەو دەسەڵات و توانایەی کە ئەو گوڵە قەشەنگ و جوانەی دەرکرد، کە توانای پەڕین و پیتاندنی پێداو ئەو بەرە جوانەی دروستکرد کە تام و بۆنی خۆش و بەسوودی هەیە، ئەو توانا و دەسەڵاتەشە کە مرۆڤ دروستدەکاتەوە و ئەیژێنێتەوە لە دوای مردن و نەمانی. ئەوە ساناترین شتە بۆ خوای گەورە (سبحانە وتعالی).

بەمجۆرە خوای گەورە لە نێوان باوەڕی زیندووبوونەوە لە دوای مردن، دەرهێنانی ڕووەکەکان بەهۆی ئاوەوە، دەبەستێتەوە بە یەکەوە، بۆ فێرکردنی مرۆڤەکان و هەستکردنیان بەوەی کە چۆن باوەڕ بە نادیارەکان بکەن.

سەرچاوە:
http://quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=539



## سەرنجڕاکێشترین شت لەسەر زەوی ئەو شاخ و داخە بڵندانەیە .. بۆچی دروستکراون؟ ئایا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) نهێنی دروستکردنی ئەم شاخانەی باس کردوە؟

نهێنی دروستبونی چیە؟ ئەرکی چیە؟ بۆچی خوای گەورە دروستی کردوە؟ زانایان بەوردی وەڵامی ئەم پرسیارانەیانە داوەتەوە.. زەوی ناسەکان باس لەوە دەکەن کە زەوی لەسەرەتای دروستبونی پڕبوە لە گڕکانو زەمین لەرزەو درز.. زەوی هەرگیز جێگیر نەبوە. کاتێکیش توێکڵی زەوی ساردبۆتەوە ئەم بەرگە بەردینەی لێ دروست بوە کە ئەمڕۆ دەیبینین.

بەرگی زەوی ڕۆژێ لە ڕۆژان پێش چەندین بلیۆن ساڵ جموجوڵی زۆری تێدابوە. زەوی ناسەکان باس لە بەشەکانی بەرگی زەویمان بۆ دەکەن کە بریتیە لە تابلۆ گەلێک. توێکڵی زەوی بەستراوە بەیەکەوە بەڵکو بریتیە لە تابلۆ گەلێک کە بەردەوام دەجوڵێت. بەهۆی گەرمی ناخی زەوییەوە ئەم تابلۆیانە جموجوڵی توند و بەهێزی دەبێت ئەمەش هاوسەنگی زەوی تێک دەدات لەکاتی سوڕانەوەی بەدەوری خۆردا. کەواتە ژیان لەسەری مەحاڵ بوە.

بەڵام جموجوڵی تابلۆکان و بەریەک کەوتنیان بوە هۆی دروستبونی شاخەکان و جێگیربونی سەرئەنجام بووە هۆی جێگیربونی توێکڵی زەوی و گەڕانەوەی هاوسەنگی بۆی.

کەواتە ئەو ڕاستیە زانستیە سەلمێنراوەی کە لە توێژینەوەکانی زەوی ناسی دەیدۆزینەوە بریتیە لەوەی کە زەوی لەسەرەتای دروستبونی لەرزاوو ناجێگیربوە.. ئەوجا زنجیرە چیای دورودرێژ دروست بوە کە ڕەگەکەی بە دەیان کیلۆ مەتر بۆناو بەرگی بەردینی زەوی درێژبۆتەوە.. ئەمەش بۆتە هۆی جێگیربونی گۆی زەوی.




وێنەیەکی کۆمپیوتەری.. ڕەگەکانی شاخ دەخاتەڕوو.. کە وەك مێخ وایە.. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ۝٧ ﴾ النبأ.

ئەم راستیە بەتەواوەتی لە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ دەبینینەوە کە دەڵێت: (لما خلق الله الأرض جعلت تميد فخلق الجبال فعاد بها عليها فاستقرت)رواه ترمذي.

واتا: (کاتێک خوای گەورە زەویی دروست کردوە بەملاو بەولادا لار دەبوەوە.. ئەوجا شاخەکانی دروست کرد.. ئیتر جێگیر بوو).

وشەی (تميد) لە فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ واتا لاردەبێتەوە و وەک کەشتی چۆن لەسەر دەریا هاوسەنگی تێک دەچێت و لەنگەر ناگرێت و شەپۆلی دەریا خەریکە وەری دەگێرێت. زانستیش ئەم راستیەی سەلماندوە کە توێکڵی زەوی لەسەر دەریایەکی ئاگرین لەنگەری گرتوە و پلەی گەرمیی دەگاتە هەزاران پلەی سەدی.



ئەو چینەی کە لەژێر توێکڵی زەویدایە زانایان بە چوارچێوەی لاوازی زەوی ناوی دەنێن.. وە لە بەردی تواوەی زۆر چڕ و گەرم و پەستاندار پێک دێت کە شەپۆلی گەرمای توندی تیا دروست دەبێت ئەمەش دەبێتەهۆی جوڵاندنی بەشەکانی توێکڵی زەوی بەشێوەیەک هەست دەکەیت کە ژێر و بان دەبێت.. جا بونی شاخەکان لەسەر ئەم توێکڵەیە رۆڵێکی گرنگی هەیە لە راگرتنی هاوسەنگی زەوی و جێگیربونی و بە باشی سورانەوەی لە خولگەکەیدا.. لێرەشدا سەرنجی ئەم فەرمودە گرنگەی پێغەمبەر ﷺ دەدەین کە راستیەکی زانستی لەخۆ دەگرێت بەشێوەیەک کە هەموو وشەکانی فەرمودەکە رێک هاوشێوەی دواین توێژینەوە و لێداوانی زەوی ناسەکانی ئەمرۆیە.

## زانایان لە توێژینەوە نوێکانیاندا دەڵێن:

The resulting collision pushed up the mountains, and also produced an underlying thick, dense «root» that sat down in the crust

پرۆسەی بەریەک کەوتن لە نێوان تابلۆکانی زەویدا، شاخەکانی هێناوەتە کایەوە و چینێکی ئەستوری دروستکردوە لەسەر شێوەی رەگێکی ئەستور کە دەخرێتە ناو توێکڵی زەویدا. هەروەها ئەم توێژینەوەیە دوپاتی دەکاتەوە کە رەگی شاخەکان پێش یەک بلیۆن ساڵ دروست بوە بەڵام لوتکەی چیاکان داخوراوە و رەگەکان ماوەتەوە، پاش ئەوە واتا پێش 100 - 250 ملیۆن ساڵ «سەردەمی دەینەسورەکان» توێکڵی زەوی سەرلەنوێ توشی دارزان بوە و شاخەکان سەر لەنوێ لەماوەی ملیۆنەها ساڵ دروست بونەتەوە.. جا رەگی ئەم شاخانە لەسەر بەردی ئاگرین لەنگەری گرتوە.. بەرزبونەوەی شاخەکان هۆکارێک بوە بۆ دروستبونی دۆڵەکان.. دۆڵەکانیش روبارەکانی لێ دروست بوە.

جا گەورەیی خوا لەوە دەردەکەوێت کە ئایەتێک هەیە لە قورئانی پیرۆز رێک باسی ئەم توێژینەوەیە دەکات.. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا ..... ﴿٣﴾ ﴾ الرعد.

واتا: هەر خودایە کە ئەم زەمینەی راخستوە و گەلێک کەژ و چیا و روباری تێدا دابین کردوە.

ئەم ئایەتە باس لە جوڵەی توێکڵی زەوی دەکات یان ئەوەی کە پێی دەوترێت تابلۆکانی زەوی (مَدَّ الْأَرْضَ)، پاشان شاخەکان دروست دەبن کە لەسەر بەردی ئاگرین لەنگەری گرتوە وەک کەشتیەکانی ناو دەریا (وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ)، پاشان روبارەکان دروست دەبن (وَأَنْهَارًا). سەرنجی وردی و رەوانبێژی وشەکانی قورئان بە.



## پرسیارەکە ئەمەیە:

کێ پێغەمبەری ﷺ بەم راستیانە ئاگادارکردەوە؟ کێ ئەم زاراوە زانستیانەی فێرکردوە؟ چونکە وشەی (تميد، لاردەبێتەوە) وردترین وشەیە بۆ باسکردنی دۆخی زەوی لە سەرەتای دروستبونی.. هەروەها وشەی (فاستقرت، ئەوجا جێگیر بو) گونجاوترین وشەیە بۆ باسکردنی دۆخی زەوی لە پاش دروستبونی شاخەکان.. ئایا ئەم فەرمودەیە بەڵگەیەکی رون و ئاشکرا نیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە خۆی پێغەمبەری ئاگادارکردۆتەوە و پێغەمبەریش ﷺ بەبێ زیاد و کەم زانیاریەکانی پێ گەیاندوین.

---

سەرچاوە:
http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2012-12-04-18-31-08/1049-2013-03-18-22-54-38

سەرچاوەی نوسەر:
http://www.bbc.co.uk/news/science-environment-15749757#panel1



# لێکۆڵینەوە نوێکان فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ دەچەسپێنن

و: ئەندازیار زانیار ئەنوەر ئەحمەد

هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ باسیکردون زانست پشتڕاستیان دەکاتەوە، ئەمڕۆ زانایان فەرمایشتی پێغەمبەر بۆ بەشکردنی خواردن دوبارە دەکەنەوە...

لێکۆڵینەوەیەکی بەریتانی نوێ، کە ڕێکخراوێکی ناحکومی بەناوی (بەرنامەی کار بۆ سەرچاوە پاشەڕۆیەکان) دەڵێت: (سێ یەکی ئەو خواردنەی مرۆڤ دەیکڕێت چارەنوسی بۆ ناو تەنەکەی پاشەڕۆکانە، تەنها کۆمپانیای (تسکو)ی بەریتانی، گەورە کۆمپانیای بواری خواردنگا ساڵانە 60000 تەن لەپاشەڕۆی خۆراکی فڕێدەدات).کێشەیەکی جیهانی گەورەیە، پێویستە ڕوبەڕوی ببینەوە هەر وەکو لێکۆڵەر (دیفن نیچە) کە ئەندامی ڕێکخراوی خواردن و کشتوکاڵ (فاو)ی سەر بە نەتەوەیەکگرتوەکانە، دەڵێت: «لەسەرمانە دەستبکەین بە هۆشیارکردنەوەی بەکاربەرەکان، کە بە فیڕۆدانی مادەی خۆراکی کێشەیەکی گەورەیە، لە هەموو ساڵێکدا ملیۆنان تەن لەخۆراک فڕێدەدرێتە تەنەکەی خۆڵەوە بە بێ سوود لێوەگرتن...» بیربکەنەوە ئەگەر ئەم بڕە خۆراکە بەکاربێت بۆ خزمەتی هەژاران! ئایا مرۆڤێکی برسی دەمێنێت لەسەر ڕوی زەویدا!؟

ئەڵمانیا بە یەکەم دەوڵەتی ئەوروپی هەژماردەکرێت کە پێویستی کردوە لەسەر بەرهەم هێنەرانی مادەی خۆراکی کە خۆیان ڕزگاربکەن لە پاشەڕۆ خۆراکیەکان، لەدوای ئەو فەرەنسا دێت کە لە ساڵی 2012 یاسای خۆ ڕزگارکردنی لە پاشەڕۆی خواردن بەسەر شوێنەکانی فرۆشتنی خۆراکدا پێویست کرد. وە شارەزایان ئاواتەخوازن ئەمە گەشە بکات و ببێتە شتێکی گشتی لەسەرجەم وڵاتانی ئەوروپا.

لێکۆڵەرەوان وای دادەنێن کە ڕێگریکردن لە بەفیڕۆدانی مادەخۆراکیەکان بە فەرمانی قورس نابێت وە کێشەی فڕێدانی پاشەڕۆی خۆراکی دەتوانرێت کێشەی برسێتی لە وڵاتانی تردا نەهێڵێت، شارەزایانی خۆراک لە ئەمڕۆدا ئامۆژگاری خەڵک دەکەن بە ئەوەی پاشەڕۆی خواردن فڕێ نەدەن و هەوڵ بدەن سوودی لێ وەربگرنەوە یان بیدەن بەو کەسەی کە پێویستی پێیەتی.

USDA Foreign Agricultural Service

GAIN Report

Global Agricultural Information Network

THIS REPORT CONTAINS ASSESSMENTS OF COMMODITY AND TRADE ISSUES MADE B
USDA STAFF AND NOT NECESSARILY STATEMENTS OF OFFICIAL U.S. GOVERNMENT POLICY

Voluntary . Public

**Date:** 4/23/2013

**GAIN Report Number:** GM13011

**Germany**

**Post:** Berlin

**Anti Food Waste Movement Gets Government Support**

**Report Categories:**
Agriculture in the News
Climate Change/Global Warming/Food Security
National Plan

**Approved By:**
Paul Spencer

**Prepared By:**
Kaela McCabe, Sabine Lieberz

چەندەها ڕێکخراو دروستبون بۆ پاراستنی پاشماوەی خواردن و چارەسەری کێشەی بەفیڕۆدانی خۆراک بۆ ئەوەی چارەسەری هەژاری و برسیەتی بکەن هەتا ئەم بابەتە بۆتە جێگای گرنگی حکومەتەکان، ئاڕاستەی خەڵکی دەکەن بە گرنگی پارێزگاری ژینگە و تێرکردنی هەژاران و فڕێنەدانی پاشەڕۆی خۆراک، وە وازهێنان لەکڕینی خواردن لەسەرو پێداویستیەکانیەوە.

فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ:

ئاشکرایە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکردووە بەپێدانی خواردن بە دراوسێ و هەژار و کەمدەرامەتان... دەیفەرموو: (طعام الاثنين كافي الثلاثة وطعام الثلاثة كافي الأربعة) [رواه البخاري] واتە: «خواردنی دوان بەشی سیان دەکات وە خواردنی سیانیش بەشی چوار دەکات»، ئەم بنەمایە ئاماژە دەکات لەسەر پێویستی بەفیڕۆنەدانی خواردن.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت ﷺ: (من كان عنده طعام اثنين

فليذهب بثالث. ومن كان عنده طعام أربعة فليذهب بخامس أو سادس)... ئەمە بانگەوازێکی ئاشکرایە بۆ تەواو خواردنی ئەو خۆراکەی هەتە و هیچی لێ فڕێ نەدەیت و هەوڵ بدەیت بەشی کەسانی تری لێ بدەیت، بۆ نمونە دراوسێکەت یان هاوڕێکانت یان نزیکەکانت..

سەیرە هەمان ئامۆژگاری پێغەمبەرە ﷺ کە ئێستا لێکۆڵەرەوان دوبارەی دەکەنەوە بەهەمان شێوە:




ئەم وێنەیە وەرگیراوە لە ماڵپەڕێکی ئەڵمانی، دەستپێشخەری پیشان دەدات بۆ بەشکردنی خۆراک لەگەڵ کەسانی تردا لەجیاتی فڕێدانی. جا ئایا پێغەمبەر ﷺ پێش 1400 ساڵ ئەم پێشەنگیەی نەکردووە؟

پێغەمبەر ﷺ چارەسەری بە فیڕۆدانی خۆراکی بە چەند وشەیەکی سادە کردووە و، خەڵکیش لێیان وەرگرتوە و هەتا ئێستا کاری پێ دەکەن... بەڵام ئەمڕۆ زانایان و دەوڵەتان دۆش داماون نازانن چۆن چارەسەری ئەم کێشە گەورە بکەن...

کەواتە ئیسلام خۆشی و چاکەی تێدایە بۆ کەسانی تر و خواردن پێدانیان و ڕێزگرتنی میوان و خێرکردن بەنزیکەکان، وە هەروەها هانمان دەدات بۆ پارێزگاری ژینگە و دوورکەوتنەوە لە پیسکردنی (بە فیڕۆدانی خۆراک سێ یەکی پیسکردنی ژینگە پێکدەهێنێت و لەکاتی پارێزگاریکردن لە خۆراک بە پێی ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری ڕەحمەت سێ یەکی پیسکردنی ژینگەش کەمدەبێتەوە).

---

سەرچاوە:
http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2012-12-04-18-32-28/1534-2013-11-20-07-34-49

سەرچاوەی نوسەر:
http://www.dw.de
http://www.un.org/en/zerohunger/pdfs/ThinkEatSave.pdf
http://www.bmelv.de/SharedDocs/Standardartikel/EN/Food/Labelling
www.bmelv.de/SharedDocs/Standardartikel/EN/Food/TooGoodForTheBin.html
http://www.bmelv.de/SharedDocs/Reden/EN/2011/01
http://www.bmelv.de/SharedDocs/Pressemitteilungen/EN/2012/66
http://gain.fas.usda.gov/Recent%20GAIN%20Publications/Anti%20Food%20Waste%20Movement%20Gets%20Government%20Support_Berlin_Germany_3-7-2013.pdf

هەواڵی زانستی

# ئێستا لە مەریخ خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت و لە خۆرهەڵاتەوە ئاوا دەبێت

و.مامۆستا جەمال قەرەداخی

زانا گەردوونیەکان ڕایانگەیاند کە هەسارەی سور واتە مەریخ لە چەند هەفتەی ڕابوردوودا، لە جوڵەکەیدا و بە ئاراستەی خۆرهەڵات هێواشبۆتەوە، تا لە ڕۆژی 4 شەمە 30 تموزی ئەمساڵ 2014 لە جوڵە دەکەوێت بە ئاڕاستەی لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات ،پاش ئەوە لە دوو مانگی ئاب و ئەیلول و تا کۆتایی ئەیلول مەریخ دەستیکردەوە بە جوڵە بەڵام ئەمجارەیان بە ئاراستەی خۆرهەڵات بەرەو خۆرئاوا واتە بە پێچەوانەی جوڵەی ئاسایی خۆی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە ئێستادا خۆر لەسەر مەریخ لە خۆرئاواوەی هەڵدێت و لە خۆرهەڵاتی سەر ئەو هەسارەیە ئاوا دەبێت.

ئەوەش دیاردەیەکی سەیرە و بە retrograde motion دەناسرێت و بە پێی زانا گەردوونیەکان ئەو دیاردەیە بەلای کەمەوە یەک جار بە سەر هەموو هەسارەکاندا دێت و لە نێویشیاندا هەسارەکەی خۆمان زەویە، کە ئەو دیاردەیەی لە ڕێدایە و ڕۆژێک دێت کە ئێمە لێی بێ ئاگاین تیایدا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت و لە خۆرهەڵات ئاوادەبێت !!!

زاناکانی شەریعەش دەفەرموون ئەو ڕۆژە دێت بە سەر زەویدا کە بە ڕۆژی (الطلوع ) ی دادەنێن و تیایدا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت و لە خۆرهەڵات ئاوادەبێت و ئەو دیاردەیە یەک جار ڕوودەدات و دوای ئەوە زەوی دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی. لە فەرموودەکانی پەیامبەری ئیسلامیشەوە محمد ﷺ ئاماژە بەو دیاردە گەردوونیە کراوە و دانراوە بە یەکێک لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی یان نزیکبوونەوەی ئەو ڕۆژە، بۆ نمونە ئەم فەرموودەیە کە دەفەرموێت « عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال ( لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها ، فإذا طلعت فرآها الناس آمنوا أجمعون، فذاك حين لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا) رواه البخاری ومسلم




هەیڤ: ئەم دیاردەیە ئاساییە بۆ مەریخ وە تا ئێستا جاری تریش ڕوویداوە و لە ماوەی دوو ساڵدا چەند جارێک دووبارە دەبێتەوە وە زاناکان وتویانە بەسەر زەویشدا دێت بەڵام هێشتا ئەوە ڕوینەداوە.

---

سەرچاوە:
http://mars.nasa.gov/allaboutmars/nightsky/retrograde/
http://www.moontracks.com/mars_ingress.html















# پێڵاوی زیرەکی شایەتی نزیکبونەوەی قیامەت دەدات!

**پێڵاوە زیرەکەکە لەگەڵ خاوەنەکەیدا قسە دەکات: ئەم دەستەواژەیە یەکێکە لەو داهێنانەی کە شایەتی دەدات بە نزیکبونەوەی قیامەت.**

و: ناسک ئیسماعیل عەزیز

دوایین داهێنانی ساڵی 2014، لە ژێر ئەم ناونیشانەدا هاتووە:

پێڵاوێکی زیرەک دروست کراوە و بە مانگە دەستکردەکانەوە بەستراوە، ئەم پێڵاوە ئەو ڕێگا دروستەت نیشان دەدات کە دەبێت بیگریتە بەر!! با پێکەوە لە ئەو موعجیزە ناوازە و پێغەمبەرانەیە وردبینەوە:

یەکێک لەو داهێنانە سەرسوڕهێنەر و تازانە، پێڵاوی زیرەکە کە، لە ڕیزبەندی دا بە دوهەم داهێنان دادەنرێت، لە دوای تەلەفۆنی زیرەکەوە، بەڵام ئاخۆ ئەرکی ئەم پێڵاوە چی بێت و لەبەر چی ئەم ناوەی پێ بەخشرابێت؟!

ئەم پێڵاوە بۆ ئەو مەبەستە دروست کراوە کە، هەواڵ بە خاوەنەکەی بدات لە بارەی ئاڕاستەکانەوە، بەتایبەتی لە کاتی گەشتکردن دا، بە جۆرێک کە لەرەلەری دیاریکراوی لێوە پەیدادەبێت و لە ڕێگەی (جی پی ئێس)ەوە ئەو ئاڕاستەیە دەستنیشان دەکات کە، دەبێت خاوەنەکەی بیگرێتە بەر. ئەم پێڵاوانە پەیوەندی دەکەن بە مانگە دەستکردەکانەوە و تەکنیکی ئاڕاستەکردن لە مەودای دورەوە بەکار دێنن بە مۆبایل.




پێڵاوە زیرەکەکە زۆر شت بەخاوەنەکەی ڕادەگەیەنێت، نمونەش بۆ ئەوە ئاڕاستە دروستەکانە، هاوکات کۆمپانیاکان لە هەوڵی ئەوەدان کە زیاتر پەرەی پێبدەن، بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر بە خاوەنەکەی بدات، هۆکارەکەشی بۆ ئەو تایبەتمەندی یە دەگەڕێتەوە کە لە ئەم پێڵاوە دا هەیە کە، دەتوانێت لە ڕێگەی بلوتۆسەوە پەیوەندی بە مۆبایلەوە بکات و مرۆڤیش دەتوانێت هەر لە هەمان ڕێگەوە پەیوەندی پێوە بکاتەوە.

لەم دوایی یەدا، کۆمپانیاکان هەڵساون بە پەرەپێدانی ژمارەیەکی زۆر لە پێڵاوە زیرەکەکان کە، شتی ئەوتۆ ڕادەگەیەنن کە، بەلای خاوەنەکانیانەوە گرنگن، بۆ نمونە بۆ ئەو نەخۆشانەی کە توشی لەدەستدانی یادەوەری بون واتە (ئەلزهایمەر)، ئاڕاستە دروستەکانیان نیشان دەدەن، بەوەش بە ئاسانی ڕێگاکەیان بۆ دەدۆزرێتەوە. ئەوانەش کە بیناییان لەدەست داوە، دەتوانن سود لەم پێڵاوە وەربگرن بۆ دۆزینەوەی ڕێگاکەیان بەبێ هەڵەکردن.

ئەم بابەتە لە ناوەڕاستی ساڵی 2014 دا، لە ئەنتەرنێت بڵاو کراوەتەوە بە ناونیشانی:

هێندە نابات پێڵاوە زیرەکەکە پێت دەڵێت بۆ کوێ بڕۆیت!
(Smart shoes will soon tell you where to go)




لێرەا وەک ئەوەی پێڵاوەکە گفتوگۆ بکات و هەواڵی گرنگ بدات بەخاوەنەکەی، بەڵام ئەم قسە کردنە قسەکردنێکی خۆمان ئاسایی ڕاستەقینە نی یە، بەڵکو بە شێوازێکی ئەلکترۆنی قسەکردنەکە جێبەجێ دەکات.

ئاشکرایە ئەم داهێنانە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئاسایی و باو و دیارە، بەتایبەتی لەدوای ئەو پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەی کە، لە بواری پەیوەندی یەکان و تەکنەلۆژیایی ژمارەیی دا هاتە کایەوە، بەڵام ئایا 1400 ساڵ لەمەوبەر، هەرگیز بەخەیاڵی کەس دا دەهات کە، داهێنانێکی لەم جۆرە بێتە کایەوە؟!

با ئێستا لە ئەم بەشەی فەرمودە پیرۆزەکە ورد بینەوە کە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (والذي نفسي بيده لا تقوم الساعة حتى يكلم الرجل نعله) (رواه ابن حبان)... واتە: (سوێند بە ئەوەی گیانی منی بەدەستە، قیامەت هەڵناسێت تا مەردوم لەگەڵ پێڵاوەکانی خۆی دا قسە نەکات)!!.

پاکو بێگەردی بۆ خوای بەرز و باڵا.

سەرچاوە:
http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-22-25-21/1696-2014-07-30-13-42-23
http://www.dailymail.co.uk/sciencetech/article-2291275/SXSW-2013-Googles-Hi-tech-shoes-nag-sofa-work-out.html

سەرچاوەی نوسەر:
http://content.usatoday.com/communities/ondeadline/post/2011/10/gps-shoes-for-alzheimers-patients-coming-to-market/1#.U9ffjbPlrAw
http://nypost.com/2014/07/24/smart-shoes-will-tell-you-where-to-go/
http://www.economicpolicyjournal.com/2014/07/smart-shoes-will-soon-tell-you-where-to.html



# ئیعجازی زانستی

ن: عبدالمجید زندانی     و: خالد حسن علی

## ئەو دەمارانەی هەست بە ئازار دەکەن، تەنیا لە پێستدا هەن




ئەو دەمارانەی بە سوتانی ئاگر یان سەرمای توند ئازاریان دەگات، تەنیا لە پێستدا هەن، هەر لەبەرئەوەشە لە کاتی لێدانی دەرزیدا لەکاتی چونە ژورەوەی لە پێستدا مرۆڤ هەست بە ئازار دەکات و هەر کاتێك دەرزیەکە گەیشتە گۆشتەکە ئازارەکە نامێنیت، ئەم ڕاستیە پزیشکیە قورئانی پیرۆز باسیکردوە:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ ﴾النساء 56

واتە: بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە، لە ئایندەدا دەیانسوتێنین بە ئاگری دۆزەخ، هەموو جارێك کە پێستیان داوەشا و سوتا و هەڵقرچا، پێستی تر دەکەین بە بەریاندا، بۆ ئەوەی بە چاکی سزا و ئازار بچەژن.

## شیری ئاژەڵان لە خۆراکی ناو ڕیخۆڵە باریکە دەپاڵێورێت:



دوای ئەوەی کە خۆراك هەرس دەبێت و بە شلی دەچێتە ناو ڕیخۆڵە باریکەوە، پاشان ماددەی خۆراکیی دەچێتە خوێنەوە و لەوێشەوە شیر لە گوانەکاندا دەپاڵێورێت، پاشماوەکەشی لە شێوەی پشقل و جگە لەو دەردەکرێت، ئەم ڕاستیە زانستیە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە: ﴿ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗۖ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصٗا سَآئِغٗا لِّلشَّٰرِبِينَ ٦٦ ﴾سورة النحل.

واتە: بەڕاستی لە بونی ماڵاتدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگەی سەرنج و تێڕامانە، لە نێوان ئەو شتانەی کە لە سکیاندا هەیە، لە گژو گیای هەرس کراو و خوێندا، شیرێکی پاك و بێگەرد و خۆش و بەتام بەرهەم دەهێنین بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە.



# بۆ نەوجەوانان

وەرگیراوە لە: کتێبی موسوعة العلامة الزنداني

## سەرکەوتن بۆ ئاسمان سنگ توند دەکات



ئەو کەسەی بۆ ئاسمان سەربکەوێت هەوای باشتر هەڵدەمژێت، بەڵام کاتێك مرۆڤ فرۆکەی نوێ و کەشتی ئاسمانی دروستکرد و بۆ ئاسمان سەرکەوت، دەرکەوت سەرکەوتن بۆ ئاسمان سنگ توند دەکات و، دەگاتە ئەوپەڕی پلەکانی هەناسە توندی، ئەویش لەبەرئەوەی هەرچەندە مرۆڤ بۆ ئاسمان سەربکەوێت هەوا کەم دەبێتەوە، ئەم ڕاستیە زانستیە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە: ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ ﴾

واتە: جا ئەو کەسەی (خێری تێدا بێت) و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئاینی ئیسلام، ئەو کەسەش خوا بیەوێت گومڕای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە (چۆن توشی تەنگە نەفەسی و دڵە تەپێ و خوێن بەر بون دەبێت) (تەفسیری ئاسان).

## مانگ داگیرساو بووە، دواتر ڕوناکیەکەی نەماوە

مانگ داگیرساو و ئاگر بوە و دواتر کوژاوەتەوە و ڕوناکیەکەی نەماوە، ئەو ڕوناکیەش کە لە شەودا هەیەتی تەنیا ئاوێنەی چرایەکی ترە کە خۆرە، پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴾ الأسراء.



واتە: نیشانەی شەو کە مانگە کوژاندمانەوە، نیشانەی ڕۆژ کە خۆرە بە ڕوناکی هێشتمانەوە. موفەسیرەکان دەڵێن: (آیة اللیل) مانگە و (آیة النهار) خۆرە، ئیبن عەباس لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت: (کان القمر یضیء کالشمس) واتە: مانگ وەك خۆر ڕوناکی داوە، (فمحونا آیة اللیل) واتە: ڕوناکیەکەیمان نەهێشت. پاشان قورئان باسی مانگ و چراکەی دەکات (خۆر)، دەفەرموێت: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ ﴾ الفرقان. واتە: پیرۆزی بۆ ئەو خودایەی کە لە ئاسماندا بورجی داناوە هەروەها چرا و مانگێکی ڕوناکی داناوە. خوای گەورە بە خۆری فەرمووە: چرا (سراجا)، ئەگەر مانگیش وەك خۆر داگیرساو بوایە، ئەو کاتە دەیفەرموو: (سراجین) واتە: دوو چراکە، بەڵام ئێستا کە تەنیا خۆر داگیرساوە تەنیا بە خۆر دەفەرموێت (سراج). ئاشکرایە ئەمەش لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە دوای ئەویش بە چەندین سەدە نەزانراو بوو.



## چەمکی ژینگە پارێزی لە ژێر سایەی ئیسلامدا/ 2

# چەمکی ژینگە پارێزی لە ژێر سایەی فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ

سەردار عەبدولڕەحمان ئیبراهیم

ئاشکرایە بەشێوەیەکی گشتی ئیسلام بایەخی تەواوی داوە بە بابەتە ژینگەییەکان، ئەمەش لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەنگی داوەتەوە، هەروەها ڕێنمایی زۆر و چڕ و پڕیشی بەیان کردوە بۆ مرۆڤەکان، هانی مرۆڤیش دەدات کە پارێزگاری لە ژینگە بکات و هەمیشە لاگیری خێر و ئاوەدانی زەوی بێت، نەک خوانەخواستە سەرقاڵی تێکدان و پشێوینانەوەی کاری خراپ و شێواندنی ژینگە، بۆ ئەو مەبەستەش ئیسلام چەندین ڕێسا و ڕێنمایی داناوە، کە جێ بەجێکردنیان ئەگەری ژینگەیەکی تەندروست بۆ گرۆی ئادەمیزاد دێنێتە کایەوە، بۆیە دەبێت هەمومان لەوە هۆشیار بین و وەک هەست کردن بە بەرپرسیارێتی ئاینی و مرۆیی و نیشتیمانی، بەئەرکی پارێزگاری ژینگە هەڵبستین، پێغەمبەری خواش ﷺ چەندین فەرمودەی هەیە بۆ پاراستنی ژینگە کە خۆی دەبینێتەوە لە بوارەکانی (دارستان و سەرچاوەکانی ئاو و سامانی ئاژەڵ و پاک و خاوێنی مرۆڤ) جا لێرەوە چەند لایەنێک دەخەینە ڕوو، کە ئیسلام بەو هۆیەوە هانمان دەدات و هۆشیارمان دەکاتەوە بۆ پاراستن و پارێزگاریکردنی ژینگە. لەوانە:

**هاندان بۆ نەمام چاندن و سەوزایی لە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ:**

1- (ما من مسلم يغرس غرسا، أو يزرع زرعا، فيأكل منه طير أو إنسان أو بهيمة إلا كان له به صدقة )(البخاری).. واتا: (هیچ موسڵمانێک نیە کە درەختێک بنێژێت، یان تۆوێک بکاتە بن زەوی و پاشان پەلەوەر، یان ئاژەڵ، یان مرۆڤ، سودمەند ببن لەو بەروبومانە، بۆ ئەو دەبێتە خێر و بۆی دەنوسرێت).

2- (من نصب شجرة، فصبر على حفظها، والقيام عليها حتى تثمر، فإن له في كل شئ يصاب من ثمرها صدقة عند الله عز وجل).. واتا: (هەرکەس درەختێ بنێژێت و ئارام بگرێت لەسەر پاراستنی تا دێتە بەرهەم، هەر شتێک سود مەند ببێت لە بەربومەکەی لای خوا بۆ ئەم بەخێر بۆی دەنوسرێت).

3- (إن قامت الساعة وبيد أحدكم فسيلة (نخلة صغيرة) فإن استطاع أن لا يقوم حتى يغرسها فليفعل )(احمد).. واتا: (گەرهات و یەکێک لە ئێوە نەمامێکی بە دەستەوە بوو دەیویست بینێژێت و لەوکاتەدا دنیا کۆتایی هات، ئەگەر دەرفەتی هەبوو با کۆڵ نەدا و درەختەکە بنێژێت).

4- (من أحيا أرضا ميتة فله فيها أجر) (احمد).. واتا: (هەر کەسێک زەویەکی وشک زیندو بکاتەوە (بیکاتە کشتوکاڵ) ئەوا پاداشت وەردەگرێت.

5- (لا تقتلوا امرأة، ولا صغيرًا رضيعًا، ولا كبيرًا فانيًا، ولا تحرقوا نخلاً، ولا تقلعن شجرًا، لا تهدموا بيوتًا).. واتا: (پێغەمبەری خوا لە جەنگی (موئتە) وەسیەتی کردوە بە سوپاکەی کە ئافرەت نەکوژن، مناڵی شیرە خۆرە نەکوژن، پیر و پەکەوتە نەکوژن، ئاگر لە دارخورما بەرنەدەن، دار مەبڕن، خانوەکانیش تێ مەدەن).

6- ئەمەش هەڵوێستێکی ناوازەی هاوەڵێکی پێغەمبەرە ﷺ لەسەر گرنگی و بایەخی سەوزایی و چاندن: (روي أن رجلا مر بأبي الدرداء -رضي الله عنه-. وهو يغرس جوزة، شجرة جوز، فقال: أتغرس هذه وأنت شيخ كبير، وهي لا تثمر إلا في كذا وكذا عاما؟ فقال: أبو الدرداء: ما عليَّ أن يكون لي أجرها، ويأكل منها غيري؟!).. واتا: (دەگێڕنەوە کابرایەک بە لای ئەبودەردائدا تێپەڕی، لەوکاتەدا خەریکی ناشتنی درەختێکی گوێز بو، کابراش پێی دەڵێت: تۆ بەم تەمەنە پیریەتەوە خەریکی ناشتنی ئەو درەختە گوێزەیت کە دەزانی زۆردرەنگ دێتە بەرهەم؟ ئەویش دەڵێت: بە هیوای ئەوەی من پاداشتەکەی وەربگرم و، کەسانی تریش لە بەرهەمەکەی بخۆن).

**هاندان بۆ پاراستنی ڕێگەوبان لەفەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ:**

سەبارەت بە پاکوخاوێنی ڕێگاوبان گەلێ فەرمودەی پێغەمبەرمان بە دەستەوەیە ﷺ، کە بە زۆری هانی بڕواداران دەدەن بۆ پاراستنی دەوروبەر و ڕێگاوبان، وەک ئەو فەرمودەیەی کە ئەو کارە بە یەکێک لە جۆرەکانی ئیمان دادەنێت کە خەوش و خاڵاک و ناڕەحەتی ڕێگاوبان لابردن بەشێکە لە بەشەکانی ئیمان:

1-إماطة الأذى عن الطريق صدقة).. واتا: (هەرکەسێک شتێک لابدات لەسەر ڕێگا کە ئازاری خەڵک بدات ئەوە بەخێر بۆی ئەژمار دەکرێت).
2- (اتقوا اللاعنين، قالوا: وما اللعان يارسول الله؟ قال: الذي يتخلى في طريق الناس، وفي ظلهم). واتا: (خۆتان بپارێزن لەوشتانەی کە دەبنە هۆکاری نەفرین کردن لێتان، ئەو کەسەی لەسەر ڕێگاوبانی خەڵکی، یان لە سێبەردا پیسی دەکات).
3- (اتقوا الملاعن الثلاث: البراز في الموارد، وقارعة الطريق، والظل).. واتا: (خۆتان لەو سێ شتە بپارێزن، کە دەبنە هۆکاری نەفرین کردن لێتان، پیسایی کردن لە سەرچاوەی ئاو و شوێنی ئاو هەڵگۆستن و لەسەرە ڕێگا و بن سێبەر).
4- (إياكم والجلوس في الطرقات، قالوا: يا رسول الله ما لنا بد من مجالسنا نتحدث فيها، قال صلى الله عليه وسلم: إذا أبيتم إلا المجلس فأعطوا الطريق حقه. قالوا: وما حقه. قال: غض البصر وكف الأذى ورد السلام والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر).. (صحيح مسلم) واتا: (پێغەمبەر ﷺ فەرموی (لەسەر ڕێگا دامەنیشن) ئەوانیش وتیان ناتوانین لەسەر ڕێگا دانەنیشین و قسەی تێدا نەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرموی ئەگەر هەر وازناهێنن لەسەر ڕێگا دەبێت مافی ڕێگا بدەن. وتیان مافی ڕێگەوبان چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: پاراستنی چاو لەحەرام و نەبونی ئازار و زیان بۆ هیچ کەسێک، وەڵامدانەوەی سەلام و ڕێنمای کردنی سەرلێشوا و ڕێپیشاندەر، فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغەکردن لە خراپە.)
5- (الإيمان بضع وستون شعبة أعلاها لا إله إلا الله وأدناها إماطة الأذى عن الطريق).. واتا: (ئیمان حەفتا و ئەوەندە بەشەیە هەرە بەرزەکەی وشەی (لا إله إلا الله)یە، هەرە خوارەوەشی ئیمان لادانی شتێکە لەسەر ڕێگا کە ئازاری هەیە بۆ موسڵمانان).

هاندان بۆ پاراستنی سەرچاوەکانی ئاو لەفەرمودەکانی پێغەمبەری نازدارمان محمد ﷺ:-

1- (روى عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) قال: إن النبى صلى الله عليه وآلـه وسلم مَرَّ بِسَعْدٍ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ فَقَالَ: (مَا هَذَا السَّرَفُ؟ فَقَالَ: أَفِي الْوُضُوءِ إِسْرَافٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَإِنْ كُنْتَ عَلَى نَهَرٍ جَارٍ) رواه أحمد وابن ماجة).. واتا: پێغەمبەر ﷺ بەلای (سەعد)دا تێ پەڕی کە سەرقاڵی دەست نوێژ گرتن بو، پێی وت: (ئەوە چیە ئەو زیادە ڕەویە؟ سەعدیش دەڵێت: بۆ لە دەست نوێژیش زیادە ڕەوی کردن هەیە؟ پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا دەڵێت: بەڵی لە دەست نوێژیش ئاو زیاد بە فیڕۆ بدەیت زیادە ڕەویی کردنە، با لەسەر ڕوبارێکی ڕۆیشتوش بیت.
2-( لا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنه).. واتا: (میز مەکەنە ناو ئاوێکی وەستاو و پاشان خۆشتانی تێدا بشۆن).
3- ( نهى عن البول فى الماء الراكد).. واتا: (پێغەمبەر ڕێگری کردوە لەوەی میز بکرێتە ناو ئاوێکی وەستاو (مەنگ).
4- ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ پڕیەتی لە هاندان و بایەخدان بە پاراستنی خواردن و خواردنەوە و پارێزگاری کردن، لە پاکو خاوێنیەکەیان، تا ئەوەی کە بە پێویستی بگێڕێت لەسەرمان کە شەوانە، لەکاتی خەودا سەری قاپ و بەقرەج و سەتڵ و ئەو ئامێرانەی کە بەکاریان دێنین، بۆخواردن و خواردنیان تێدابێت، سەریان بنێینەوە و ئاگر بەهەڵگیرساوی بەجێ نەهێڵین و دەڵێت: (إذا نمتم فأطفئوا المصباح، وأغلقوا الأبواب، وأوكوا الأسقية -اربطوا قرب الماء- وخمروا الشراب)..

# ئەستێرەیەکی تازە دۆزراوەتەوە، پێکهاتەکەی لە ئەڵماسە

**و: کاوە شارباژێڕی**



ئەم ئەستێرەیە نزیکەی ٩٠٠ ساڵی ڕوناکی لە زەویەوە دوورە، مێژوی دروست بونی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروست بونی بونەوەر بەر لە ١١ بلیۆن ساڵ، کە لە قۆناغەکانی کۆتاییدا بووە، قەبارەی ئەم ئەستێرەیە بەئەندازەی زەوی دەبێت، بەدرەوشانەوەکەی ئاسمان دەڕازێنێتەوە و گرانبەهاترین ئەستێرەیە لە بونەوەردا...!! لێرەوە لەوە حاڵی دەبین کە پێویستە سوپاسگوزاری خوای گەورە بین، پاکوخاوێنی و گەورەیی بۆ ئەو زاتە بەسۆز و میهرەبانە، جێگەی خۆیەتی کە باسی ئەو ئاماژە قورئانی یە جوانە بکەین کە باس لەجوانی و ڕازاندنەوەی ئاسمان دەکات بەم ئەستێرانە:

﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ ﴿١٦﴾﴾ الحجر

جیگەی خۆیەتی کە بپرسین کێ ئەو ئەستێرەیەی دروست کرد؟ وە کێ ئاسمانی پێ ڕازاندوە؟ وکێ لە کتێبەکەیدا هەواڵی لەو بارەیەوە داوە؟ ئایا ئەو کەسە زاتی (الله) نییە؟

www.kaheel7.com



# زەوی لە نێوان زانست و قورئاندا

ن: کارزان زانست خواز

**وتارێکی زانستیە کە دروست بون و شێوە و جوڵەی زەوی باس دەکات بە شێوەیەکی زانستی، دواتریش بەراوردی دەکات بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز.**

زەوی ئەو هەسارەیەیە کە دەکەوێتە ڕیزبەندی هەسارەی سێیەم لە دوری خۆرەوە، هەروەها بە هەسارە شینەکە ناسراوە بەهۆی ئەوەی نزیکەی 75% ڕوبەرەکەی بە ئاو داپۆشراوە، وە بە هەسارەی زیندوش ناوی دەهێنن چونکە تاکە هەسارەیە لە هەمو گەردوندا زیندەوەری لەسەر بێت و بۆ ژیان بشێت. وە قەبارەکەی دەگاتە نزیکەی 611314477055 کم$^3$. بە پێی بیردۆزی بیگ بانگ زەوی پێش 4.5 بلیۆن ساڵ دروست بوو کە سەرەتا وەکو کۆمەڵێک لە بەردی گڕگرتوی بڵێسەداری بەیەکەوە نوساو بوو(میتیۆر)، وە پڕی بوو لە بورکانی یەکجار گەورە و بەهێز، دواتر بە تێپەڕبونی کات پلەی گەرمیەکەی کەمێک دابەزی وە لەگەڵ ئەو دوکەڵەی لە بورکانەکان دەردەپەڕی هەڵمی ئاویشی لەگەڵ بووە، کاتێک زیاتر پلەی گەرمی زەوی دابەزی هەڵمە ئاوەکە بوو بە هەور و بەرز بوەوە بۆ کەشی ئاسمان و دواتر چڕ بوەوە و بۆ هەزاران ساڵ باران باری بە بەردەوامی و جۆگەلە و ڕوبارەکان دروستبون و ئاوێکی زۆر چوو بە ژێر خاکی زەویدا. وە لەدوای ئەمە میتیۆرێکی بچوکتر لە زەوی لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆرەوە بە خێراییەکی یەکجار زۆر بە ئاڕاستەی زەوی هات و خۆی کێشا بە زەویدا کە لە ئەنجامدا بوە هۆی تەقاندنی بەرگە بەردینەکەی زەوی و چاڵێکی یەکجار مەزنی دروست کرد و بەم هۆیەش ئاوی ژێر زەوی هاتە دەرەوە کە ئێستا بەم چاڵە گەورە پڕ ئاوە دەوترێ زەریای هێمن (المحيط الهادي) وە لەدوای ئەو زەبرەی ئەم میتیۆرە بە زەوی گەیاند چەند جارێک میتیۆرەکە لەڕیەوە واتە دورکەوتەوە و نزیک بوەوە لە زەوی هەتا گەیشتە خاڵی هاوسەنگی (balanced point) و دواتر بەهۆی کاریگەری هێزی کێشی زەوی ئەم میتیۆرە دەستیکرد بە خولانەوە بە دەوری خۆی و دواتریش سوڕانەوە بە دەوری زەوی لە ناوەندە دوری400 – 384 کم، ئەم میتیۆرە ئێستا ئێمە پێی دەڵێین (moon) مانگ.

بەڵام هەتا ئەوکاتەش هیچ زیندەوەرێک لەسەر زەوی بونی نەبوو، دواتر ژیان دەستی پێ کرد و ئاوەدان کرایەوە بە زیندەوەران و مایکرۆ ئۆرگەنیزمەکان و ڕوەک و گیا. ئەمە کورتەیەک بوو لەسەر هەسارەی زەوی بە پێی نوێترین تیۆری زانستی.

**ئێستاش زەوی بەراورد دەکەین بە ئایەتەکانی قورئان:**

- شێوەی زەوی: قورئانی پیرۆز بە دوو جۆر باسی شێوەی زەوی دەکات، یەکەم لە ئاستی بینەرێک لە سەر ڕوی زەوی.. دوەم لە ئاستی بینەرێک لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر:

- یەکەم: لە ئاستی بینەرێک لەسەر ڕوی زەوی:

﴿ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ ﴾ سورة الغاشية.

(ایە ناڕوانن کەوا خوا چۆن زەوی بۆ تەخت کردون؟).

- دوەم: لە ئاستی بینەرێک لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر:

﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ سورة الرحمن.

واتە: (ئەی گرۆی جن و ئادەمیزاد ئەگەر توانیتان لە تیرەی ئاسمانەکان و زەوی دەربچن ئەوا دەربچن و کونی بکەن، بەڵام ناتوانن دەربچن مەگەر بە دەسەڵاتی خوا نەبێت).

خوای گەورە لە ئایەتی یەکەم زەویمان بۆ وێنا دەکات وەکو تەنێکی تەخت کە دەڵێت ئایە نابینن خوای گەورە زەوی بۆ ئێوە تەخت کردوە لێرەدا بۆ ئاسانکاری تێگەیشتن لە فەزڵی تەختایی زەوی خوا بەم شێوەیە باسی کردوە، کە ئەگەر تەختایی تیا نەبا هەموی چیا و دۆڵ و کەند و بەردەڵان بوایە ئەوکات ژیان زۆر ئەستەم دەبو لەسەری، ئەمە لە چاوی بینەرێک لەسەر ڕوی زەوی.

- بەڵام لە ئایەتی دوەم باسی شێوەی زەوی و ئاسمان دەکات کە لە چاوی بینەرێک لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر، لەم ئایەتەی سورەتی (الرحمن) خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە ئێمەی مرۆڤ و جن هەرگیز ناتوانین لە تیرەی ئاسمان و زەوی دەربچین، باشە دەزانین ئاسمان لە چاوی بینەرێکەوە لەسەر زەوی شێوەی گۆیی یە و تیرەی هەیە، بەڵام لە چاوی بینەرێک لەسەر زەوی هەرگیز زەوی بە شێوەی

گۆیی (کُرَوِي) نابینرێت هەتا نوسەری قورئان باسی تیرەی زەوی بکات، قورئان تاکە کتابێکە کە 1440 ساڵ لەمەو بەر لەگەڵ وشەی زەوی ناوی تیرەی هێنابێ. با بزانین تیرە چیە؟

تیرە Diameter قُطر: بریتیە لەو هێڵە راستەی کە دوو خاڵی بەرامبەر یەک لە بازنەیەک یان گۆیەکدا بەیەک دەگەیەنێت کە بە چەقەکەیدا دەڕوات.

با وای دابنێین کەقورئان وای زانیوە زەوی تەنێکی تەختی بازنەییە نەوەک گۆیی!! ئەی باشە ئەگەر تەخت بوایە بۆچی تەحەدیی هەمومانی دەکرد کە ناتوانین کونی بکەین؟! خۆ کونکردنی تەنێکی تەخت زۆر ئاسانە!! کەواتە بێگومان زەوی گۆییە و تیرەی هەیە هەر وەکو لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسی کراوە.

وە ئێستا زانایانی جیۆلۆجیا دەڵێن کونکردنی زەوی مەحاڵە و موستەحیلە! چونکە تیرەی گۆی زەوی یەکسانە بە 12756کم، پێشکەوتوترین ئامێرەکانی مرۆڤ تا ئێستا توانیویەتی تا قوڵایی 13 کم، بڕوات و دواتر ئامێرەکان لە کاردەکەوتن و نوکەکانیان دەتوانەوە بە هۆی گەرمی ناوەکی ناخی زەوی! کە زانایان دەڵێن پلەی گەرمی ناوەکی زەوی یەکسانە بە پلەی گەرمی خۆر! کەواتە با خەیاڵمان ئاسودە بکەین هێشتا لە توێکڵی زەویداین!!!

هەروەها لە دوو شوێنی تر لە قورئاندا زۆر بە رونی باسی شێوەی گۆیی زەوی کراوە بەڵام نامەوێ وتارەکەم زۆر درێژ بکەمەوە هەر بەم بەڵگەیەی کە باسم کرد کۆتایی بەم بەشە دێنم.

ئەمانە هەمویان ئیعجازی زانستین لەسەردەمی زانست و تەکنۆلۆژیادا گرنگی خۆیان هەیە.

- خەڵقی زەوی: خوای گەورە بە دوو ڕۆژ بە هەژماری ڕۆژەکانی خۆی زەوی دروست کرد بە بەڵگەی ئەم ئایەتە:

﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ ﴾فصلت.

- ئایا زەوی سەرەتا دروستکراوە یان ئاسمان لە ڕوی کاتەوە؟ زانست دەڵێت سەرەتا ئاسمان دروست بوە دواتر زەوی. ئەی قورئان؟ با سەرنج بدەین، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ ﴾النازعات.

لەم چەند ئایەتەدا خوای گەورە پێش 1440ساڵ بە شێوەیەکی زۆر ڕون و زانستیانە ئەو نهێنیەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە ئاسمان پێش زەوی دروست کراوە، وشەی «بعد» واتە دوا یان لە پاش بە ماوەیەکی تەواو ئەگەر ماوەکە کەم بوایە خوای گەورە وشەی «ثم» یان «فـ» بە کاردەهێنا کە ئەم دوو وشەیە بۆ کورتە مەودا بەکار دێت لە زمانی عەرەبیدا، کەواتە خوای گەورە دەفەرموێت لەدوای ئەوەی ئاسمانم دروستکرد و تاریکی و روناکیم بەدیهێنا، ئەوجا لەدوای ئەمە زەویم دروستکرد و فراوانم کرد یان خرم کرد بە شێوەی نیمچە گۆیی.

جوڵەی زەوی:

زەوی سێ جوڵەی سەرەکی هەیە، یەکەمیان لە دەوری خۆی دەخولێتەوە، دوەمیان لەدەوری خۆر دەسوڕێتەوە، سێیەمیان لەدەوری گەلە ئەسێرەی کاکێشان دەسوڕێتەوە.

رەخنەگرانی ئیسلام هەمیشە ئەم قەوانەمان بۆ لێدەدەنەوە کە دەڵێن بەهیچ جۆرێک قورئان باسی سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆر نەکردوە. با بزانین رەخنەگران راست دەکەن یان قورئان و ئیعجازیەکان؟

لە دوای ئەوەی کامێرای جوڵەداری کۆنترۆڵکراو (کریتەرکامەکان)ی دەزگای ناسا پێشکەوتنیان بەخۆوە بینی و توانیان مواسەفاتی (فری موڤینگ) بۆکریتەرکامەکانیان زیادبکەن هەڵسان بە وێنەگرتنی جوڵەی زەوی و هەسارەکانی تری کۆمەڵەی خۆر بە شێوەی ڤیدیۆ کە جوڵەی راستەقینەی زەویمان بۆ دەردەخات، وە گەیشتنە ئەم دەرەنجامانەی خوارەوە:

1- لە ناو هەمووگەلە ئەستێرەی کاکێشان کە 200, 000, 000, 000 ملیار ئەستێرەیە تەنها یەک ئەستێرە هەیە کە ناخولێتەوە بەڵکو بە شێوەی هێڵی دەجولێت و دەڕوات بە عەرەبی بەم جوڵەیە دەوترێت «جریان» کە ئەم ئەستێرەیەش خۆرە The Sun.

2- لە ئەنجامی ئەم جوڵەیەی خۆر بۆیان دەرکەوت کە هەسارەکان بە دەوری خۆردا ناسوڕێنەوە !! بەڵکو خۆر بە شێوەی هێڵێکی راست دەڕوات و هەسارەکانیش دوای دەکەون بە جوڵەشێوەی لەولەبی، واتە ئەگەر بینەرێک لە تەنیشتی کۆمەڵەی خۆرەوە سەرنج بدات ئەوە دەبینێت هەموو هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر هەڵدەبەزن و دادەبەزن بە شێوەی راست و چەپ لە هەمان کاتدا، رونکردنەوەی جوڵەی لەولەبی بە نوسین کەمێ گرانە بەڵام بە ڤیدیۆ زۆر جوان لێی تێدەگەین. بە واتایەکی تر زەوی بە شێوەی 3D فریکوێنسی دەسوڕێتەوە بە دەوری خۆردا نەوەک بە شێوەی 2D. ئەمە نوێترین دۆزینەوەی زانایانی ناسایە.

ئایا قورئان باسی نوێترین جوڵەی زەوی کردوە کە ئێستا زانایان دۆزیویانەتەوە؟ بێگومان بەڵێ. با سەرنج بدەین:

سەرەتا گرنگی ئیعجازەکە لەمە دەردەکەوێت قورئان لەناو هەموو تەنەکانی ئاسمان بەس لە (خۆر)دا باسی (جریان) یان ڕۆیشتنی خۆری کردوە بە شێوەی هێڵێکی راست! خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ ﴾يس.

واتە: خۆر دەڕوات بە شێوەیەکی سەربەخۆ (جریان)، ئەمە توانا و ویستی خوای بەڕێز و زانایە.

جوڵەی زەوی:

خوای گەورە نـەیفەرموە: (ألم نجعل الأرض دوّارا؟) واتە نەیفەرموە ئایا زەویمان نەکردوە بە تەنێکی خولاوە؟! چونکە ئەم دەستەواژەیە هەڵەیە!

بەڵکو فەرمویەتی:

﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ ﴾ المرسلات.

واتە: ئایا زەویمان نەکردوە بە کیفات؟ یان سیفەتی کیفاتمان بە زەوی بەخشیوە.

با بزانین کیفات مانای چیە؟

عەرەب دەڵین: كَفَتَ الطّائِرُ، أَي اَسْرَعَ وَ تَقَلّبَ في طَيَرانِهِ.

واتە: باڵندەکە بەرز و نزم بوەوە، یان خێرا بو و هەڵگەڕایەوە لە فڕینەکەی، کە جوڵەی راستەقینەی باڵندەکان شەپۆلدار و پێچاوپێچە کە 100% لە جوڵەی زەوی دەچێت. زەویش لە کاتی ڕۆیشتنی لەگەڵ خۆر لەناو گەلەئەستێرەکەماندا بە شێوەی پێچاوپێچ و شەپۆلدار (حركة كفاتية) هەڵبەز و دابەز دەکات لەسەر هێڵەئاڕاستەی جوڵەی خۆر بە شێوەیەکی 3D.



